# کۆنتراکت

ژمارە 3 | گۆڤارێکی سیاسییە | ساڵی 1998

## جیابوونەوە و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ، مافێکی موتڵەقی خەڵکی کوردستانە



## بیابانەکانی خوارووی عێراقیان کرد بە گۆڕستانی کورد

لە ئەنفالی ژمارە چواردا بخوێننەرەوە

## چوار کەس





و





## دوو پرسیار



## کێ بەرپرسیارە لە ئاشبەتاڵی ١٩٧٥

## ڕێپۆرتاجێک دەربارەی (پ.ک.ک) و منداڵان

# کام بڵاوکراوەو کام نووسەر؟

کە پاپۆڕێک نوقوم دەبێت بێگومان ئەو ئاڵایەش کە بەسەریەوە دەشەکێتەوە لەگەڵ پاپۆڕەکەدا دەچێتە ژێر ئاو. کورد لە هەر زەمانێکدا هەلێکی بۆ ڕەخسابێت و ئەگەر ڕۆژنامەیەکیشی تیادا دەرکردبێت، ئەوا لەگەڵ نەمانی ئەو هەلەدا ڕۆژنامەکەش تەواو بووە. بۆیە تەمەنی کورتی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەی کوردیی بە گشتی ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە تا کورد خۆی حوکمی خۆی نەکات، ڕۆژنامەدەرکردن بۆ کورد هەلێکە هەر ئەوەندە بڕ دەکات تا داگیرکەرەکانی دەکەوونەوە سەر خۆیان.
ڕۆژنامەی ئو.ئێن.تێ (UNT)، کە لە شاری ئۆپسالەی سویددا بڵاودەکرێتەوە، تەمەنی ١٠٦ساڵە. داگنس نیهێتەر (DN)ی سەرانسەری سوید ١٣٤ ساڵە هەیە. ئافتۆن بلادت(Afton Bladet)ی ئێواران ١٥٨ ساڵە دەردەچێت.
لە کاتێکدا کەڕۆژنامەی میللەتان لە پێشکەوتنێکی بەردەوام و لە پێشخستنێکی دیسان بەردەوامی ئەو کولتوورەدان کە هەوڵی بۆ دەدەن، ڕۆژنامەو بڵاوکراوەی کوردیی بەپێچەوانەی ئەوانەوە، زۆربەیان چەند ساڵێک یان چەند ژمارەیەکیان لێ دەردەچێت. ئەم وەستان و تەمەنکورتی و بەردەوامنەبوونەی بڵاوکراوەی کوردیی، دیارە وەستان و تەمەنکورتیی و بەردەوامنەبوونیی ئەو مەبەستانەشە کە بڵاوکراوەکان دەیانەوێت بیان هێننە ئەنجام.
ئێمە هەر بڵاوکراوەکانمان نییە کە ناتوانن بەردەوام بن. ئەوانەی لە هەڵەبجە کوژران، ئەنفالکراوەکان، ئەوانەی لە زیندانەکاندا لە دار دران، ئەو پێشمەرگانەی بە شاخەوە کوژران، هیچیان تەمەنی خۆیان تەواو نەکردبوو. جگە لەمانەش، دارگوێزی کوێستانەکان، کانی، دارستان، پیشە، خێزان ئەمانە کامیان توانیوویانە سروشتییانە لە شوێنی خۆیاندا بەردەوام بن؟
دوژمنەکانی کورد تەنها خەریکی کوشتارو وێرانکردنی خاک نین، دەیانەوێت ئەو کولتوورەش بخەنە ژێر خۆڵەوە کە سەرچاوە لە مافە سروشتیەکانەوە وەردەگرێت. حکومەتی سەددام کە ئەنفالی کورد دەکات، بۆمبای کیمیاویی بەکار دێنێ و خاکەکەی بە مین دەڕێژێت، لە هەمان کاتیشدا لە بەغداد بڵاوکراوەی کوردیی دەردەکات. بۆیە سەیر نییە ئەگەر تەمەن درێژترین بڵاوکراوەی کوردیی بڵاوکراوەیەک بێت کە دوژمنی کورد دەری بکات نەک کورد خۆی.

گۆڕەکان تەنها سەرقاپی لاشەکان نانێنەوە. مێژووی تێکشکانی کورد تەنها مێژووی تێکشکانی جوڵانەوە ڕزگاریخوازەکانی نییە. کاتێک کە حیزبەکان دەبن بە دەسیاوی حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، دەبێت تاوانبارەکانی ئەنفالیش جێگای پێشمەرگە بگرنەوەو پەیامی ئەو کەسانەش کە چوونە بەردەمی پەتی سێدارە لەگەڵ لاشەکانیاندا داپۆشرێت. شێخ عەبدوڵای نەهری، کە ویستی کورد ڕزگار بکات، لە هەموو کوردستاندا مەترێکی بەرنەکەوت تیایدا بمرێت، لە حیجاز نێژرا. ئێمە خەڵکێکین کاتێک کە هەلێکمان بۆ هەڵکەوت بۆ ڕزگاربوون، نەمان توانی ئێسقانی لەداردراوەکانی موسڵ بهێنینەوە بۆ دایکی شەهید، بۆیە دەریای نێوانی تورکیاو یۆنانیشمان کرد بە گۆڕستانی ژمارەیەکی زۆری منداڵ، پیر و لاو.
پیاوێکی پیر لە ئەنفالەکەدا لەبەرچاوی خۆی چل کەسی لە چاڵێکدا دەکوژن و دوایی ئاگریان تێبەردەدەن. تەنها یەک منداڵی بەرێکەوت بۆ دەردەچێت، ئەویش کاتێک لە ئوردوگایەکدا دەردەکەوێت کە منداڵە کوڕەزاکەی لە مردن شاردۆتەوە، ئەفسەرەکە لە بەرچاوی مامە پیرە یەک حەیزەران دەدات بە پشتی منداڵەکەداو یەک لەقە دەکێشێت بە سەریا و دەمی لە خۆڵەکە دەچەقێنێت. کابرای پیرە دەڵێت ئەمە دوا کەسم بوو کە لەبەرچاوم کوشتیان. ئەنفال هەموومان ناویمان بیستووە بەڵام چی لە ئەنفالدا ڕویداوە؟ ئەمە بێگومان ئەمەریکیی یان ئوستراڵیی هەیە کە لەوپەڕی دنیا خوێندویەتییەوە، بەڵام کوردەکە خۆی لێی بێئاگایە، چونکە بە زمانی ئینگلیزیی بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لە بڵاوکراوەی کوردیدا گرنگیی پێ نەدراوە.
هەروەکو چۆن لە کۆمەڵگایەکدا مامۆستایەک ئەرکی فێرکردنی لەسەرە، پزیشکێک فەحسی نەخۆش، سەربازێک پاراستنی نیشتیمان، ئاواش یەکێک کە دەستی دایە قەڵەم هەر بابەتێک بنووسێت بەرپرسیارییەکی خۆی تێدایە.

گۆڤاری کۆنتراکت لەگەڵ ئەوەدا نییە کە نووسەر و هونەرو بڵاوکراوە بە گشتی بە چاوێکی پیرۆزەوە تەماشا بکرێن. ئەو دیکتاتۆرو خوێنڕێژانەی لە مێژوودا تاوانبارن بە وێرانکاریی و کوشتنی چەندەها کەس، لەبەرئەوە پیاوخراپ نەبوون کە نووسەر قاتیی بووەو، حکومەتەکانیشیان نەیان توانیووە ڕۆژنامەو گۆڤار دەربکەن.
بۆیە گۆڤاری کۆنتراکت لە یادی سەدساڵەی ڕۆژنامەگەریی کوردییدا دەڵێت:
تەنها نووسین و ڕۆژنامە خۆیان بەس نین. ئەو پرسیارەش دەخاتە بەردەمی خوێنەری کورد کە لەخۆی بکات بەرامبەر هەر نووسەرو بڵاوکراوەیەک: کام بڵاوکراوە، کام نووسەر؟

**هیچ کەسێک مافی ئەوەی نییە بڕیار بدات یەکێکی تر چۆن بیربکاتەوە، یان چۆن هەبێت لە ژیاندا. بێ جیاوازی رەگەز و جنس.**

# کۆنتراکت

## لەم ژمارەیەدا ئەم باسانە دەخوێنیتەوە:



- ئەو کوردە ئەنفالکراوانە کاتێک بۆ کوشتنیان دەبردن لە تینواندا ناچار بوون میز بکەنە پێڵاوەکانیانەوە و بیخۆنەوە؟ ( ل14)
- دوای ڕاپەرینەکە، هیوای گەڕانەوە کەوتە دڵی کوردی دەرەوەی وڵات. بەڵام زۆری نەخایاند، بەپێچەوانەوە کۆچی ئەوانەی ناوەوەش بەرەو دەرەوەی کوردستان دەستی پێ کرد. ( ل23 )





کاتێک دەسەڵاتێک ڕەوا سیاسییەکەی نامێنێت، ⟺ توانای سیاسی میللەت لە چیدا خۆی دەبینێتەوە؟

بڕوانە لاپەڕە (44)

# کوردستان: زەمینەی شارستانیەت؟

## ئەو میللەتەی مێژووی خۆی نەزانێت، ناتوانێت داهاتووی خۆی بنیات بنێت

**هێمن**



دکتۆر کەمال مەزهەری مێژوونووس لە پێشەکی کتێبی "کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا" دەنووسێت: "بەداخەوە تائێستا بە قووڵی و بە شێوەیەکی رێکوپێک و زانستیانە لە هیچ قۆناغێکی مێژووی گەلی کورد نەکۆڵراوەتەوە. رەنگبێ بتوانین تا رادەیەک مێژووی نوێ (بەتایبەتی سەدەی نۆزدە) و چەند رووبەکی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لەم حوکمە دەرهاوێژین."

رێنێ مۆریس(١) دەربارەی کورد دەنووسێت: "خەڵکە چیاییە چاونەترسەکانی شاخی زاگرۆس بۆڕی یۆنانییەکانیان دابۆیەوە بەوەی کە لە نەوتەکەیان چەکی شەڕ دروست بکەن پێش ئەوەی کە یۆنانییەکان ئاگر بکەنەوە. ئاگری میدییەکان بۆ یەکەم جار لەمێژوودا بە سەرکەوتوویی بەکارهێنرا". هیرۆدۆتسی مێژوونووسی یۆنانی (٤٢٥-٤٨٥ پ.ز.) کە بەهۆی ئەوەی خاوەنی کۆنترین کتێبە دەربارەی مێژوو بەباوکی مێژوو ناسراوە، وەسفی سرووشتی شۆڕشگێڕیی کوردەکان دەکات. کزینۆفۆنی سەرکردە و بیرەوانی یۆنانی (٣٥٥-٤٣٠ پ.ز.)، کە قوتابی فەیلەسوفی بەناوبانگی یۆنانیی (سوقرات) بوو، لەکتێبی (ئەناباسیس)دا باسی ئازایی و بەجەرگیی کوردەکانی کردووە، کە ناوی نابوون بە (کوردۆجی). کاتێک لەشەڕی فارسەکاندا بەزی، کزینۆفۆن بەناچاریی لەگەڵ دە هەزار سەربازدا بەرێگای کوردستاندا پاشەکشەیان کرد. کزینۆفۆن لەکتێبەکەیدا دەنووسێت کە ئەو زیانەی کوردەکان بە حەوت رۆژ بە لەشکرەکەیان گەیاند لە هەموو ئەو زیانانە زیاتر بوو کە لەشکرەکەی لەشەڕیدا لەگەڵ فارسەکاندا لێی کەوت.

ئەو میللەتەی کە مێژوونووسە کۆنەکان بەو شێوەیە باسیان کردووە میللەتێکی بێ مێژوو نییە، بەڵام میللەتێکە کە مێژووی خۆی بەتەواوی نازانێت. هۆی سەرەکی ئەم مێژوونەزانینە پەیوەندی هەیە بەوەوە کە ئەو رژێمانەی کوردستانیان دابەشکردووە بە هەموو جۆرێک هەوڵیان داوە مێژووی کورد بسڕنەوە و وا لە خەڵکی کورد بگەیەنن کە میللەتێکی بێ مێژوون. لەم وتارەی خوارەوەدا(٢) بۆمان دەردەکەوێت کە کوردستان یەکێک بووە لەو جێگایانەی یەکەم شارستانییەکانی لێوە درووست بووە.

### زەمینەی شارستانیەت(٢)

کوردستان، کە ناوچەیەکی گیایی و شاخوداخاوی ئاووهەوا خۆشە، لە سەرووی شاری بەغدادەوە دەست پێدەکات و کەوتۆتە عێراق و ئێران و تورکیا و سوریاوە. خەڵکە جووتیارەکەی ژیانێکی وا دەژین کە کەم گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە لەم چەند سەدساڵەی دواییدا. لە رووی مێژووییەوە، کوردستان جێگایەکی دیاری هەیە. رووداوێکی مێژوویی ئەم ناوچەیە جیا دەکاتەوە لە شوێنی دیکە. ئەو رووداوەش بریتییە لە چاندنی گەنم و ماڵیکردنی مەڕوماڵات. بەپێی ئەو بەڵگە شوێنەوارناسییانەی کە لەبەر دەستدان، ئەو هەنگاوە مەزنە یەکەمجار لێرەوە دەستی پێکردووە. ئەو کارە وای لە مرۆڤ کرد کە بتوانێت خواردنی درووست و دڵنیای لەبەر دەستدا بێت. ئەمەش ئەو بناغەیەی داڕشت کە هەموو شارستانییەتێک (گوند، شار، میللەت، ئیمپراتۆرییەت، نووسین، ئەدەب، یاسا و زانست)ی لەسەر درووست بووە.

کەس نازانێت کە ئەم جووتیارە کوردانە شێوە و رەنگی پێستیان چۆن بووە و بە چ زمانێک قسەیان کردووە. ئەمانە بەهەزاران ساڵ پێش ئەوەی کە ئێمە مێژوو بنووسین، لەبیرچووبوونەوە. ئەمڕۆ تەنیا لەرێگای ئەو شتە جێماوە کەمانەوە دەیان ناسین کە لەژێر کۆمەی ماددەی ووردوخاشبوودا (tell) دۆزراونەتەوە. ئێسقان و پارچەی کەلوپەلی ئیش و تۆو ئەوەمان پیشان دەدەن کە ئەو ژنوپیاوانە خێزانی مرۆڤیان لە پشتبەستنی تەواو بە سرووشتەوە هێنا بەرەو ئەو قۆناغەی کە تیایدا دەستیان بەسەر خواردنی خۆیاندا هەبوو و کۆنترۆڵیان دەکرد.

لەم چەند هەزار ساڵەی رابوردوودا کە مرۆڤ لەسەر زەوی پەیدابووە، چۆنییەتی و رێگای پەیداکردنی خواردن زۆر بەکەمی گۆڕراوە. لەسەرەتادا، مرۆڤ بە شێوەی گرووپی بچووک بچووک دەژیان و هەرشتێکیان دەست بکەوتایە دەیان خوارد. ژنان و

منداڵان بەری دار و تۆویان کۆ دەکردەوە و رەگی رووەکیان دەردەکێشا و ئاژەڵی کێوی وەک کیسەڵ و لولپێچ (هێلکە شەیتانۆکە)یان دەگرت. پیاوان ئەو ئاژەڵانەیان راودەکرد کە دەیانتوانی بیان کوژن. هێندێک جار خواردەمەنییان زۆر بوو، بەڵام برسێتی مەترسییەکی هەمیشەیی بوو. کاتێک گرووپێک ئەو شتانەی دەخوارد کە لە ناوچەیەکی دیاریکراودا هەبوو و دەستی دەیگەیشتێ، دەچوو بۆ جێگایەکی دیکە. لەماوەی دەهەزار ساڵێکدا، چۆنێتی خواردنپەیداکردن زۆر بەهێواشی بەرەو باشبوون رۆیشت. مرۆڤ کەرەستە و چەکی چاکتری دۆزییەوە و زیرەکترانە راوی دەکرد و بەشێوەیەکی باشتر سوودی لە رووەکی کێوی دەبینی. نزیکەی نۆ هەزار ساڵێک پێش لەدایکبوونی مەسیح، چەند گرووپێک فێری ئەوە بوون کە ژیانێکی تارادەیەک باشتر بژین بەبێ ئەوەی کە پەنا بەرنە بەر کۆچەریی. ئەم کارە تەنیا لەو جێگایانەی سەرزەمین روویدا کە بارودۆخەکەی لەبار بوو. یەکێک لەو شوێنانە باکووری عێراق (کوردستانی باشوور) بوو، کە لەوێ مەڕومالات لە قەدپاڵی چیاکاندا دەلەوەڕان. ئەم ناوچەیە گژوگیایەکی وای لێ بوو (کە گەنم و جۆ و دانەوێڵەی ئەمڕۆی لێ پەیدا بووە) کە تۆوی وای دەخستەوە کە بۆ خواردن دەشیا. بۆیە شتێکی رێکەوت نییە کە مەڕ و گەنم (دوان لەو مادده خواردەمەنییە گرنگانەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) یەکەم شت بووبن کە ماڵیکران و چێندران. زوربەی پسپۆڕەکان پێیان وایە مەڕ یەکەم سەرچاوەی خواردنی مرۆڤ بووە، کە توانیویەتی کۆنترۆڵی بکات و لە راوکردنیانەوە وردە وردە کەوتۆتە راگرتنیان و بەخێوکردنیان. پیاوان و کوڕان بەڕیز رادەوەستان و بە هاوار و دەستجوڵان ئەو مەڕە کێوییانەیان بەتەنگەی نێوان گردەکاندا دەبرد و لەوێ دەیان کوشتن. هەنگاوی دوای ئەوەی ئەم پێشکەوتنە ئەوە بووە کە ئەو ئاژەڵە کێوییانە لە کەندرێکدا پەرژینیان بەدەوردا دەکێشرا. لەماوەی چەند سەدەیەکدا، یان یەک دوو هەزار ساڵدا مەڕبەخێوکردن بەم شێوەیە بووە. کاتێک کە زستان نزیک دەبۆیەوە، زووربەی ئەو ئاژەڵە گیراوانە دەخوران. زۆر رێی تێ دەچێت کە ئەگەر زستان زۆر سەخت نەبوویێت، چەند دانەیەک لەو مەڕانەیان هێشتۆتەوە و سەریان نەبڕیون (نەیان خواردوون). ئەو مەڕانە ئەگەر گیا هەبوایە دەیان درایە و ئەگەر هیچی دیکە نەبایە، بەپووشی هەڵگیراو بەخێو دەکران. بەم شێوەیە، ئەم مەڕانە، لە بەندیدا کەوتنە زاووزێ و وردە وردە بوون بە مەڕی ماڵیی. ئەو ئاژەڵانەی کە بەئاسانی ماڵیی نەدەکران و بەهێز بوون، دەکوژران بۆ ئەوەی تووخمەکەی یان وەچەکانی وردە وردە ماڵیی بکرێن. لەکۆتاییدا، ئەو مەڕانەی کە لە قۆناغێکدا کێوی بوون، ئەوەندە ماڵیی ببوون کە بە کۆمەڵ دەلەوەڕان بێ ئەوەی ترسی راکردنیان لێ بکرێت. بەهۆی ماڵیکردنی مەڕەوە، گۆڕانکارییەکی مەزن لە شێوەی خواردن پەیداکردن و ژیانی مرۆڤدا روویدا. مەڕە ماڵییەکان جگە لەوەی لەبەردەستدا بوون، گۆشتیان لە مەڕە کێوییەکان زیاتر بوو. ئەگەر لە چەند راوێکیشدا سەرکەوتوو نەبوونایە ئەو مرۆڤانە بێ گۆشت نەدەبوون.

## چاندنی گەنم

لە ماڵیکردنی مەڕ گرنگتر، چاندنی رووەک بوو چونکە ئەو کارە زۆر خواردنی بە مرۆڤ ناساند و لە هەمووشی گرنگتر، مرۆڤی نیشتەجێ کرد. ئەم پیشەیە لەوە دەچێت کە ئافرەت دەستی پێ کردبێت. یەکەم بەرهەمی ئەو کارەیان گەنم بووە کە هەتا ئێستاش لە زۆر جێگای کوردستاندا لە خۆیەوە دەڕوێت و هەر لەسەر ئەو شێوە کۆنەش دەدوورێتەوە. ئەو گەنمە کێوییە (Triticum dicoccoides)ی کە نزیکەی هەموو جۆرە گەنمێکی دیکەی لێ دەکەوێتەوە، لە شوێنی شێدارا، کە کەوتبێتە بەرزایی نێوان (٦٠٠) تا (١٢٠٠) مەتر لە سەر رووی دەریاوە، باش گەشە دەکات. کێڵگەیەکی (Triticum dicoccoides) زۆر لە کێڵگەیەکی بچووکی گەنم دەچێت، بەڵام گوڵی ئەو گەنمە کێوییانە کورت ترن و دەنکەکانیشیان بچووکترن. کاتێک گوڵەکە پێ دەگات، دەنکەکانی بەرەو دەرەوەی قەدەکەی دێن بۆ ئەوەی بەهۆی باوە یان ئاژەڵەوە بگوێزرێنەوە. لەسەرەتادا، ژنان ئەم دانەوێڵە کێوییانەیان لێ دەکردەوە بەوەی کە گوڵەکەی بشکێنن وەیان دەنکەکانی لێ بکەنەوە. لەدواییدا، داسی دار یان ئێسقانیان بەکاردەهێنا کە بەردێکی قەراغتیژی پێوە بوو، بۆ ئەوەی کە زیاتر لە گوڵە گەنمێک ببڕنەوە. لەم ناوچەیەدا (کوردستان)، داسی کۆن دۆزراونەتەوە کە بەردەکانی وەک دەمی چەقۆ تیژ کراون. ئەم بەردانە، لەهەزاران ساڵ پێش ئێستا، بەقەدی دانەوێڵە تیژ کراونەتەوە.

مرۆڤ بەکۆکردنەوەی دانەوێڵەی کێوی نابێت بە جووتیار، هەرچەندە ئەگەر داسێکی چاکدرووستکراویش بەکار بهێنێت. بەڵام، ئەو ژنانەی کە گوڵە گەنمەکانیان لێ دەکردەوە، وردە وردە بەوەیان زانی کە گەنمەکان زیاتر دەبن ئەگەر هێندێک لەو دەنکەگەنمانە لەو شوێنانە بڕوێن کە گەنمە کێوییەکانی بەشێوەیەکی ئاسایی لێ ناڕوێت. رەنگە ئەم زانیارییە بەنرخەیان لەوەوە دەست کەوتبێت کە بینیویانە دەنکی تەڕی کەناری جۆگەکان زۆرجار رواون و بوون بە روەکی سەوزی وەک ئەوانەی بەکێوی دەڕوێن. رەنگە ژنەکان دەنکە گەنمەکانیان لەکەناری جۆگە و رووبارەکاندا چاندبێت، یان شوێنی وایان هەڵبژاردبێت کە گیای کەم بووە و بە "بێڵەکانیان" دەنکە گەنمەکانیان خستۆتە چاڵەوە. هەردوو شێوەکە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و کاتێک کە تۆزێک دڵنیاتر و شارەزاتر بوون بۆیان دەرکەوتووە کە دانەوێڵە تەنیا لەشوێنی بەرزدا ناڕوێت.

یەکەم رێگای پەیداکردنی خواردن (مەڕ و دانەوێڵە)، کە مرۆڤ توانی کۆنترۆڵی بکات، بوون بەبەردی بناغەی پەیدابوونی کشتوکاڵ. هەر کە هێندە ماڵیی بوون کە بەیانیان ببرێنە دەرەوە و ئێوارانیش بگەڕێندرێنەوە، مەڕەکان دەیانتوانی لەناوچەیەکی زۆر گەورەتردا بلەوەڕێن و ئەو گژوگیایانە بخۆن کە گەدەی مرۆڤ نەیدەتوانی هەرسیان بکات. دانەوێڵەکە لەبەر دوو هۆ بەنرختر بوو: یەکەم لەبەرئەوەی زۆر بوو، دووەمیش لەبەرئەوەی مرۆڤ دەیتوانی خواردنی وای لێ درووست بکات کە بۆ ماوەیەکی زۆر هەڵ بگیرێت.

## درووستبوونی دێ

چەند دۆنمێک زەوی دانەوێڵە دەیتوانی بەشێکی سەرەکیی خواردنی ساڵێکی خێزانێک دابین بکات. دێیەکی چەندسەد کەسیی دەیتوانی لەسەر مەڕ و دانەوێڵەکەی بژی بەبێ ئەوەی زیاتر لە چەند کیلۆمەترێک بۆ خواردن دوور بکەوێتەوە. لەراستییدا، کارەکان ئەوەندە ئاسان نەبوون چونکە هەمووزەویەک بەپیت نەبوو و مرۆڤیش باش نەیدەزانی کە چۆن وای لێبکات کە بەبەرهەم بێت. سەرەڕای ئەوەش، دەبوایە بیر لە پاراستنیشی بکەنەوە چونکە ئەو دێیەی کە جووتیارەکانی دەوڵەمەند بوون بەدڵنیایی لەلایەن راوکەری گەڕۆکەوە هێرشیان دەکرایە سەر. بەڵام دێ بەبۆنەی دانەوێڵە و ئاژەڵی ماڵییەوە گەشەی دەکرد. لە بەناوبانگترین ئەو دێیانە، دێی جارموو (Jarmo) بوو، کە یەکەم جار لەساڵی (١٩٤٧)دا لەلایەن گرووپێک لەزانکۆی شیکاگۆوە بەسەرۆکایەتی رۆبەرت ج برمیدوود (Robert J. Braidwood)ەوە دۆزرایەوە و خۆڵی لەسەر لابرا. پاشماوەکانی جارموو بریتییە لە تەپۆلکەیەکی درێژکۆلە کە کەوتۆتە سەر گردێکی رۆژهەڵاتی شاری نەوتیی کەرکوکەوە لەخوار زنجیرەچیایەکی سەرووی عێراق (کوردستان: وەرگێر). وەکو زووربەی ئەو تەپۆلکانەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، جارموو پێکهاتووە لە خۆڵ و پارچەی کەرەستەی شکاوی ئەو





ساڵی ١٩١٢

سەرچاوەی وێنەکان:
Kurdistan in
the Shadow of History,
Susan Meislas

دێیانەی کە لەسەر یەکدی درووست کراون (هەر دێیەک کە کاول کراوە، لە هەمان شوێن، لەسەر کەلاوەی ئەو دێیە دێیەکی دیکە درووست کراوە. بەم شێوەیە، هەر کەلاوەیەک چینێکی درووست کردووە کە مێژووی دێیەکی دیاریکردووە). رۆبەرت برەیدوود بەلایەنی کەمەوە (١٥) چینی لێک جیای لە جارموو دۆزییەوە، کە هەریەکەیان قۆناغی پێشکەوتنێکیان پیشان دەدا. لە چینی هەرە ژێرەوەدا (٧,٥ مەتر لەخوارەوە) برەیدوود کۆنترین و ساکارترین کەڵچەری دۆزییەوە کە بریتییە لە دێیەک کە تەنیا بەشێوەی جووتیاریی دەژیان. ئەو دێیە نزیکەی (٦٨٠٠) ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح درووستکراوە. ئەم مێژووە رەنگە بریتی بێت لەسەرەتای پێشکەوتنی هێواشی مرۆڤ بەرەو شارستانیەت. جارموو پێکهاتبوو لە (٣٠) خانوو لەناوچەیەکی دوو دۆنم و نیویدا، کە رەنگە (٢٠٠) کەسی تیادا ژیابێت و زووربەیان جووتیار بووبن. شوێنەوارناسەکان زۆر ئێسقانی مەڕی پیریان لەشوێنێکدا دۆزییەوە کە رەنگە بریتی بووبێت لە زبڵخانەیەکی گەورە. ئەم دۆزینەوەیە رەنگە ئەوە پیشان بدات کە ئەو تەمەنە لەبار بووبێت بۆ سەربڕینی ئاژەڵیماڵیی و کەمتر لەوە دەچێت کە پاشماوەی ئێسقانی ئەو ئاژەڵانە بێت کە لە راودا دەکوژران، کە چاوەڕوان دەکرێت لەهەموو تەمەنێکی تێدابێت.

## ژنان و سەرەتای تەکنیک

ژنانی ئەو دەمە شتێکی گەنمی جارموویان پێ باش نەبوو. ئەو توێکڵەی دەوری تۆوەکەی دابوو رەق بوو و بەئاسانی لێنەدەکرایەوە. جووتیاری ئەمڕۆ، گەنم لە جۆندا دەکووتن بۆ ئەوەی توێکڵەکەی لێبکەنەوە. ژنەکانی جارمووش رێی تێ دەچێت کە هەمان کاریان کردبێت. پاش ئەوە چیان دەکرد، مرۆڤ دەتوانێت تا رادەیەک لێی دڵنیا بێت. دەنکە پاککراوەکانیان دەخستە سەر بەردی قۆقز و بەبەردی بچووکتر دەیان هاڕی و دەیان کرد بە ئارد. ئەم جۆرە دەستارە زینئاسایانە بەبێ گۆڕانکاری چەند هەزار ساڵێک بەکاردەهێنران. یەکەم نان بەشێوەیەکی تەنک لەسەر بەردی تەختی بەئاگرداخکراودا درووست دەکرا. ئەو بەردانە لەزۆر ئاگردانی کۆندا دۆزراونەتەوە. هەتا ئەمڕۆش، ئەگەر مرۆڤ بچێتە ماڵی جووتیارێک لە کوردستان، دەبینێت کە ژنی ماڵەکە نانێکی خۆش بەو شێوە نۆهەزارساڵ کۆنە درووست دەکات هەرچەندە ئێستا بەئاگرێکی کەم نانەکە، لەبری بەرد، لەسەر ساجی ئاسن دەبرژێندرێت. لەچینی ژێرەوەی شوێنەواری جارموودا شتی لەقوڕدرووستکراو دەردەکەوێت کە رەنگە چێشتلێنان بەکوڵاندن پیشان بدات. ئەو مرۆڤانە بۆیان دەرکەوت کە کوڵاندن گۆشتی جیڕ نەرم دەکاتەوە و سووپ (شۆربا) و خواردنی دیکەی پێ درووست دەکات. گەنم دەکرا بەساوەر بەوەی کە دەنکە گەنمەکان دەکوڵێنران هەر بەهەمان شێوەی کە ئێستا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەکرێت. بەنەرمکردنی رەگی رووەک، دانی مرۆڤ ئەرکێکی گرانی لەکۆڵ بۆیەوە. لەچینەکانی سەرەوەی

جارمووداا فرنی قوڕ (لەشێوەی bikupe) دۆزراوەتەوە. ڕەنگە ئەم فڕنانە بۆ وشککردن و برژاندنی گەنم یان بۆ برژاندنی گۆشت و ناندروستکردن بەکارهێنرابن.

پاقلەمەنی و نیسک و بەرهەمی دیکە وردە وردە بوون بەتەواوکەری گەنم. بزنیش پاش مەڕ ماڵیی کرا، بەلام مانگا و بەراز زۆر درەنگتر ماڵیی کران. جگە لەنەبوونی مریشک و هێندێک بابەتی شیر نەبێت، خواردنی جارموو زۆر جیاواز نەبوو لەو خواردنانەی کە ئەمڕۆ لەدێیەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دەخورێت. خواردنە سادە بەسوودەکەی مەڕ و گەنم شتێکی بنەڕەتی بوو لەژیانی یەکەم جوتیارەکاندا. لە دێیە "ئاگراریەکانی" وەک جارمووداا خانووەکان زۆر لەیەک دەچوون و هیچ شتێکی لێ نەبوو کە لە کارخانە یان کەرەکی دەوڵەمەندان بچێت، بەلام کاتێک کشتوکاڵ پەرەی سەند، جووتیارەکان خواردنە زیادەکانیان دەگۆڕییەوە بەو شتانەی کە خەڵکی دیکە، جگە لە جووتیار، دروستیان دەکرد. لە کۆمەڵگای دواتردا گۆزەچی شارەزا پەیدابوون کە گۆزەی باشتریان درووست دەکرد لەوانەی جووتیارەکان لەکاتی بێنیشیدا دروستیان دەکرد. بەم شێوەیە خۆیان دەژیاند. خەڵکی پیشەیی دیکە، کە کەرەستەی تایبەتییان لەبەرد یان لە ئێسقان درووست دەکرد و بەشێک لەو خواردنە زۆرەی ئەو دێیانەیان بەردەکەوت. ئەمانە چینێکیان لەخەڵکی دەسترەنگین درووست کرد کە لە زیادبووندا بوون. خەڵکی دیکەش (ئەوانەی کە چینی بازرگانیان لێکەوتەوە) سەفەری دووریان دەکرد بۆ گۆڕینەوەی بەرهەمی دێهات بەو شتانەی کە نەیان بوو یان لە دێدا دەست نەدەکەوت، بۆ نموونە: ئۆبسیدیان (جۆرە بەردێکی ئاگرییە) کە چەقۆی تیژیان لێ درووست دەکرد.

## خاوەنداریتی و سیاسەت

ماوەیەکی کەم دوای ئەوەی مرۆڤ دەستی کرد بە زەویکێلان و بەکارهێنانی، جووتیارەکان خۆیان بەرامبەر گیروگرفتێکی زۆر سەخت بینییەوە کە ئەویش دیاریکردنی خاوەنێتی شتومەک بوو. ڕاوچی و خەڵکی کۆچەر زۆر لە مولکایەتی نازانن. ئەوان تەنیا خاوەنی کەرەستە و چەک و جلوبەرگەکانیان و هێندێک شتی شەخسی دیکە بوون. شوێنی ڕاو دەتوانرا بەیەکسانیی بەسەر هەمووانا دابەش بکرێت، بەلام ژیانی جووتیاریی جیاواز بوو. جووتیار لە خانووی هەمیشەییدا دەژین و دەبێت بزانن چ زەوییەک بکێلن و لە کوێ مەڕومالاتەکانیان بلەوەڕێنن. لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، پێویستیی درووستکردنی یاسا و کۆمیتە بۆ ئەوەی کێشەی زەوی و مولکایەتی و شتی دیکە چارەسەر بکات زیادی کرد. شوێنەوارناسەکان بەتەواوەتی نازانن جووتیارەکان چ جۆرە فەرمانڕەوایەکیان درووست کردبوو. لەسەرەتادا، زۆر ڕێی تێدەچێت کە کارەکانیان زۆر نارەسمی بووبێت. کۆبوونەوەی گشتیی لەنێو خەڵکیدا یان لەبەرچاوی پیرانی دێدا گیراوە.

خەڵکی ئەم دێیە بچکۆلانەی سەر تەپۆلکەکانی کوردستان نە بە خێرایی و نە بە هەنگاوی گەورە بەرەو شارستانییەتێکی پێشکەوتووتر نەڕۆیشتن. پاش ماوەیەکی کەم، گەیشتنە شێوەژیانێک کە زۆر لەگەڵ دەوروبەریاندا دەگونجا و زۆر پێویستیان بەگۆڕانکاریی نەبوو. بەلام لە کۆتاییدا، دانیشتوانی ئەو ناوچە فێنکە زۆر زیاد بوو. هێندێکیان ناوچەکەیان بەجێهێشت و بەرەو میزۆپۆتامیا (ئەو ناوچە تەختاییەی دەوری ڕووباری دیجلە و فورات کە بەشی خوارووی (و ناوەڕاستی) عێراقی ئێستا دەگرێتەوە) کۆچیان کرد. لێرە، ئاووهەوا گەرمتر بوو و باران ئەوەندە نەدەباری کە بتوانن حاسڵاتی زۆریان هەبێت. بەلام لە دەوروبەری ساڵانی (٥٥٠٠)ی پێش زاییندا، ئەم یەکەم خەڵکانەی ناوچە تەختاییەکە، فێربوون کە جۆگەلە لە ڕووبارەکانەوە ڕابکێشن بۆ ئاودانی کێڵگەکانیان. ئەم تەکنیکە تازەیە دەرگای پێشکەوتنێکی گەورەی کردەوە بۆ خواردن پەیداکردن و نیشتەجێبوونی خەڵکی لە قەراغی ڕووبارەکان. لەم قۆناغەی مێژوودا پێشکەوتنێکی گەورە بەسەر شارستانییەتی مرۆڤدا ڕوویدا: درووستکردنی سەدد و بەستەڵەک و کەناڵی ئاو خەڵکێکی زۆریی دەوێت و سیستەمێکیش پێویستە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان. کارمەندان درووستبوون. بەدرووستبوونی ئەم کارمەندانە، شارستانیەت هەنگاوێکی گەورەی نا بەوەی هونەری نووسین پەیدابوو، کە وای کرد یاسا و دابونەریت و شتی دیکە نووسرانەوە. نووسین دەستی پێکرد و قوتابخانە کرانەوە.

نزیکەی (٣٠٠٠) ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح، میزۆپۆتامیا، کە ئەوسا پێی دەووترا سۆمەر یان کالدیەن، وڵاتێکی خاوەن شارستانییەتێکی مەزن بوو و کۆمەڵێک شاری شورابەدەوراکێشراوی تێدابوو کە هەریەکەیان ئاینگایەکی خۆی هەبوو. میزۆپۆتامیا زۆر زیاتر لە میسر کاری کردە سەر وڵاتەکانی جیهانی کۆن. عیبرییەکان، وەک لە نووسراوەکانی ئەبرەهامدا دەردەکەوێت، بەشێکی زۆری کولتوورەکەیان لە میزۆپۆتامیاوە هێنییەوە. ئەبرەهام لە ئور (Ur)ەوە بەرەو کالدیەن (enkald) کۆچی کرد. پێشکەوتن و بیری میزۆپۆتامیا لە ڕۆژئاوا بە یۆنان و ڕۆمدا بلاوبۆوە و لە ڕۆژهەلاتیش بەرەو هیندستان و چین ڕۆیشت. ئەمە هەمووی لەوەوە سەری هەڵدا کە مرۆڤ دەستی بەوە کرد کە بە شێوەیەکی تازە خواردن پەیدابکات. ئەم شۆڕشە لەلایەن ئەو جووتیارانەوە دەستی پێکرد کە لە تەپۆلکەکانی کوردستاندا مەڕیان ماڵیی کرد و گەنمیان چاند.

## چەند ڕاستییەک دەربارەی مێژووی کۆنی ناوچەی کوردستان (٣،٢):

١- ١٢.٠٠٠ ساڵ پێش زایین: سەگ لە گورگی ئاسیاییەوە ماڵیی کرا بۆ بەکارهێنانیان بۆ بەشوێنداگەڕان (پاشماوەی ماددەی بەردبوو (فۆسیل fossil) کە لەساڵی (١٩٥٠)دا لە ئەشکەوتێکی نزیک شاری کەرکوکدا دۆزرایەوە، لەساڵی (١٩٧٠)دا بە فلۆرین شیکرایەوە و تەمەنەکەی دیاری کرا).

٢- ١٠.٠٠٠ ساڵ پێش زایین: لە ڕۆژهەلاتی نزیک، بزن لەلایەن ئەو ڕاوچیە خێڵەکیانەوە ماڵیی کرا کە پێشتر گورگیان ماڵیی کردبوو (واتە لە کورستانی ئەمڕۆدا، وەرگێڕ).

٣- ٧.٠٠٠ ساڵ پێش زایین: گەنمی ئێمەر (Emmer) کە لە (Triticum dicoccoides)ی کێوییەوە وەرگیرابوو لە ناوچەی کوردستاندا، کە پاشان بوو بە خوارووی ڕۆژهەلاتی تورکیا و سەرووی ڕۆژئاوای ئێران، ڕوا.

٤- ٦.٨٠٠ ساڵ پێش زایین: دێی کوردستان، جەرموو، کە لە سی (٣٠) خانوو درووست ببوو، چوارهەزار مەتر دووجای گرتبۆوە و دووسەد (٢٠٠) کەسی لێ دەژیا. ئەم دێیە یەکێکە لە یەکەم ناوچە کشتوکاڵییە هەمیشەییەکان. ئەم ناوچەیە لەساڵی (١٩٤٧)دا لەلایەن چەند لێکۆڵەرەوەیەکی زانکۆی شیکاگۆوە گڵی لەسەر لابرا.

### سەرچاوەکان:


١- ڕێنێ مۆریس، ١٩٨٦. کوردستان یان نەمان (کردستان او الموت). لە چاپکراوەکانی کوردولوجیا، ژمارە ٣-١٩٨٦، ١٤٤ لاپەڕە.

٢- Harry G. Nickles, 1970. Middle Eastern cooking. Time Inc.

3- James Trager, 1992. The People's Chronology. New York, 1338 pp.

# نابینایان لە سەردەمە جیاوازەکاندا

**× ئیسلام گۆڕانکارییەکی زۆری لە ژیانی نابینایاندا کردو بایەخی پێ دان**
**× ئەو خەڵکە وا دەزانێت مرۆڤێک نابینا بوو دەبێت لە ماڵەوە چاوەڕێی مردن بکات**
**× بەڵگەیەک لەوانەی کە لای خۆمان بە سوک تەماشای نابینایان دەکەن**

**دلزار حەوێزی**

لە سەردەمی یۆنانی و ڕۆمانەکاندا، ئەو کەسانەی کە لەو کاتەدا پەککەوتەو نابینا یاخود بیرکۆڵ بونایە، ژیانێکی کولەمەرگی و پەرێشان و کوێرەوەرییان دەبردە سەر. ئەم کۆمەڵە خەڵکەیان لە دوورگەیەکی دوورەوپەرێز پەرێدە دەکردو هەموو پەیوەندییەکیان بە جیهانی دەرەوەی ئەو دوورگەیەوە دەبڕی. ئەو سەردەمە وایان دەزانی کە ئەو پەککەوتانە گیانێکی شەیتانیی دوور لە مرۆڤانەیان لە لەشدایەو هەر وەک کۆمەڵە ناژەڵێک تەماشا دەکران. کەچی ئەمە زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ بۆچونی هیندییە سوورەکاندا کە بە چاوێکی پڕ ڕێزو حورمەتەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کەم ئەندامەکانیاندا دەکرد.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بارودۆخێکی دیکە بۆ پەککەوتەو نابینایان ڕەخسا. بە تایبەتی ئایینی ئیسلام گۆڕانکارییەکی زۆری لە ژیانیاندا کردو گرنگی و بایەخێکی زۆری بە نابینایان دەدا، کە ئەمەش بە جوانی لە قورئانی پیرۆزدا بەدی دەکرێت. بۆ وێنە؛ ڕۆژێک کابرایەکی نابینا دەچێتە لای پێغەمبەر(د)، کە لەبەر سەرقاڵیی هیچ بایەخێکی ئەوتۆی پێ نادات. لەبەرە ئەوە یەزدانی مەزن بە گلەییەوە ئایەتێکی قورئانی بۆ دەنێرێتە خوارەوە کە ئەویش ئایەتی: (عبس وتولى إن جائه الاعمى)یە. هەروەها لە قورئاندا هاتووە: (اما الاعمى فاولوهم) واتە کاروباری نابیانایەکان دەبێت پێش بخرێن و یارمەتیان بدرێن. وتەیەکی پێغەمبەریش هەیە دەڵێت: (ترک السلام على الاعمى خطيئه)، واتە ئەگەر چاوساخێک بە لای نابینایەکدا تێ پەڕی کردو سڵاوی لێ نەکرد، ئەوا گوناهی پێ دەگات. ئەمەش لە ڕاستیدا بایەخدانە بە نابینایان. شایەنی باسە کە یەک لە پێغەمبەرەکانیش کە "شعیب"ە هەر بە نابینایی لە دایک بووە.

گەلێک جار کەسانی نابینا بووەنەتە ئەرک و قورسایی بە سەر خێزانەکانیانەوە، چونکە باری ئابووری ئەو خێزانانە خراپ بووەو پێویستییان بە کەسێک بووە کە یارمەتییان بدات نەک ئەرکیان قورستر بکات. بە تایبەتی نابینایان لە نێوچە کەژوکێومکاندا نەیان توانیووە ئەرکی ژیانی خۆیان وەک پێویست هەڵسوڕێنن. ئەوجا ناچار بوون کە مل بەرەو مزگەوتەکان بنێن و لەوێ ژیانی خۆیان مسۆگەر بکەن. مزگەوتەکان هەر لەو سەردەمانە بە دواوە جێگەی فێربوون و حەواتەوە و پەیداکردنی پێداویستییەکانی ژیان بوون بۆ نابینایان. یەکێک لەو سەرچاوانەی کە ژیانی خۆیان پێ مسۆگەر کردووە، بەشداری کردنیان بووە لە پرسەو بۆنە ئایینیەکەکاندا کە لەوێ قورئان و حەدیسیان خوێندۆتەوە.

لەگەڵ گۆڕانی باری ئابووریی و کۆمەڵایەتی و فیکریی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییدا، ژیانی سەرجەمی نابینایانیش گۆڕرا. کردنەوەی قوتابخانەو فێرگە و پەیمانگە ڕۆڵێکی یەکجار گرنگ و بەرچاوی لە گۆڕانکارییەکانی ژیان و گوزەرانی کەمئەندام و نابینایانی جیهاندا بینی. هەڵبەت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستانیش بەر پریشکی ئەو گۆرانکاریانە کەوتن.

لە خوارووی کوردستان، لە بازێری هەولێر پەیمانگای نابینایان هەیە، کە لەوێدا ژمارەیەک لە خوێندکاران توانیویانە بە پلەی زانستیی بەرز بگەن.

هەروەها تێڕوانینی خەڵکە گشتییەکەش بەرامبەر بە نابینایان گۆڕدراوەو بە چاوێکی ترەوە تەماشا دەکرێن. ئەگەر سەردەمی جاران نابینایان ئەرکێک بووبن بە سەر خێزان و کۆمەڵەکەوە، ئەوا ئەوڕۆکە بارودۆخەکە باشترە بۆئەوەی نابینایان بتوانن کاروباری خۆیان بەڕێوە بەرن و ژیانی خۆشیان مسۆگەر بکەن.

باری دەروونی نابینایان تایبەتییەو جیاوازی زۆرە لەگەڵ خەڵکانی چاوساغدا. نابینا ناتوانێت هەموو شتێکی ناو دەروونی خۆی جێبەجێ بکات، لەبەرئەوە گەلێک شت هەیە بەناچاریی لە دڵ و دەروونیدا دەیان هێڵێتەوەو بیریان لێ دەکاتەوە. بۆ وێنە: کەسێکی نابینا گەر داوای یارمەتی لەچاوساغێک بکات بۆ بردنە دەرەوەو گەران، دەسووبرد هەست بەوە دەکات کە ئەرکێکی زۆر بۆ ئەو کەسە دروست دەکات، بۆیە وای پێ چاکترە ئەو ئەرکە نەخاتە سەرشانی کەس و ویستەکانی هەر لە ناخی خۆیدا بهێڵتەوە.

## نابینایان و چەند پرسیارێک

ئەو کەسانەی کە هەر لە زکماکییەوە نابینان ناتوانن ڕەنگەکان لە یەکدی جیا بکەنەوە. بە خەیاڵی خۆیان و تەنیا لە ڕێی ئامرازێکەوە، کە ئەویش لە دەروونیاندا هەیە، جیاوازییەک بۆ ڕەنگەکان دادەنێن.

جگە لەوە پرسیارێکی گرنگی دیکەش هەیە کە ئەویش خەوبینیە. ئایا نابینایان چۆن خەو دەبینن؟ زۆر لە دەروونناسەکانی جیهان هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، بەڵام تا ئێستا هیچ کەسێکیان نەیان توانیووە وەڵامێکی چڕوپڕ و سەد دەر سەدی ئەو پرسیارە بدەنەوە. ئەو منداڵەی کە نابینایە لە بیری خۆیدا وێنە دەکێشێت چ بۆ دایک و باوکی بێت یان بۆ دەوروبەرەکەی. کە قسە لەگەڵ دایکی دەکات ئەو شێوەیەی کە بە خەیاڵی خۆی بۆی دروست کردووە، ئا بەو جۆرە لەگەڵی دەدوێت.

پرسیارێکی دیکە کە پەیوەندی بەوەوە هەیە، ئایا مرۆڤ بە لەدەستدانی پارچەیەکی لەشی جێگەیەکی دیکەی بە هێز دەبێت؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لای من، (بەڵێ)یە. لەم ڕووەوە نابینا دەتوانێت دوو شتی سەرەکی بە هۆی ڕاهێنانەوە لە ژیانیدا بەهێز بکات. یەکەم گوێ، دووەم دەست و پەنجە. بەهۆی گوێوە دەتوانێت خەڵک و شت بناسێتەوە. بە پەنجەش نووسینی زبر بخوێنێتەوەو کەلوپەل لە یەکدیی جیا بکاتەوە.

نابینا زیاتر لە شت دەکۆڵێتەوە. ڕەنگە کەسێکی چاوساغ زۆر سەرنج بۆ قسەکان ڕانەکێشێت. بەڵام نابینا تەواوی

سەرنجدانەکەی دەخاتە سەر قسەکان.

## توانای نابینایان

لە کۆمەڵگای نابینایانی کوردستاندا چەند کەسێک توانای تایبەتیان پیشان داوە. بۆ نموونە:
**دوکتۆر کامیل بەسیر**: مامۆستای زانکۆ بوو. **مەلا ئەحمەدی کۆیە**، سەرجەمی قورئانی لەبەر بوو. **شەفیق بەیاد**، هونەرو نووسەرو هونەرمەند بوو. ئەم شەفیقە یەک لەوانەیە کە هەر لە منداڵییەوە چاوی لە دەستداوە. لە تەمەنی شەش مانگیدا کەترییەک ئاوی گەرمی پێدا ڕژاوە. هەتا ئێستاش گۆچانی بەکار نەهێناوە. ئەگەر تەنیا بە باسکردن ناونیشانی ماڵێکی بدەیتێ، ئەوا دەچێ و دەیدۆزێتەوە. چیاکانی "باواجی" و "شێرێ" و "دەرەشێر" و "سێدەکان" هەمووی گەڕاوە بێ ئەوەی کەسێک دەستی گرتبێت.
**مەلا وەسمانی** سلێمانی هەموو قورئانی لەبەرەو بە تەنیا بۆ هەموو شوێنێک هاتووچۆ دەکات. **یادگار کەریم** بە بێ ئەوەی کەسێک یارمەتی بدات توانیویەتی ئێستگەیەکی ڕادیۆ دروست بکات کە ماوەی پەنجا مەترێک بڕ بکات. **مەلا گچکە** دەستی لە هەر ئۆتۆمۆبیلێک بدایە دەیزانی بۆیاخەکەی هی فابریەکە یاخود سەر لەنوێ بۆیە کراوەتەوە.

## نابینای کوردستان و ئەورووپا

جیاوازیی نێوان نابینایانی کوردستان و ئەورووپا بەوێنەی ئاسمان و ڕێسمانە. دەتوانین ئەم جیاوازییانە زۆر بە کورتی لە چەند خاڵێکدا کۆ بکەینەوە:
١- دابینکردنی کەلوپەل و پێداویستییەکان بۆ نابینایانی ئەورووپا، هەر لە چاپ و چاپەمەنییەوە تا دەگات بەو ئامێرانەی کە بە دەنگ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، باکوورو باشوور پیشان دەدەن. مەخابن ئەو شتانە هیچی لە کوردستاندا بەدەست ناکەون. لەبەر ئەوە نابیناکانی کوردستان ناچارن پشت بە یارمەتی کەسانی دیکە ببەستن.
٢- کردنەوەی ژمارەیەک لە کۆرس بۆ نابینایان لە ئەورووپا، کە یەکێک لەوانە کردنەوەی دەورەی فێرکردنی گۆچان بەکارهێنانە، بەڵام لە کوردستان بە خەویش ئەو دەورانە بە بیردا نایەن.
٣- نابینایانی ئەورووپا زۆربەی بەرتووکە زانستییەکان و ڕۆمانەکانیان بە چاپی "برایل" یاخود بە تەسجیل و کاسێت دەست دەکەوێت و ئاگایان لە پێشکەوتنەکانی جیهانەو لە ژیان دوانەکەوتوون. ئەم شتانە ببڕای لە کوردستان بە خەونیش نابینرێن. بیریش لەوە ناکرێتەوە کە دەزگایەک بۆ چارەسەری ئەو کیروگرفتانە پێک بێت.
٤- نابینایانی ئەورووپا لە مافدا یەکسانن لەگەڵ هەموو هاووڵاتیەکی دیکەدا، لە گەڕان و سەیراندا باشترین سەفەریان بۆ ڕێک دەخرێت و بە زستان و بە هاوین دەبرێن بۆ جێی دڵگیرو هاوینەهەوار. هەموو ئەورووپاییەک بە شانازییەوە لە کاتی پێویستدا دەستی یارمەتی بۆ نابیناکان درێژ دەکەن. لە کولتووری ئەورووپاییدا ئەو بۆچوونە دواکەوتووە نامرۆڤانەیە نیە کە چاوساغێک خۆی بە چاکترو گەورەتر بزانێت وەک لە نابینایەک. بەڵام حەیف و مەخابن لە کوردستان و تەواوی ڕۆژهەڵاتیشدا پێچەوانەی ئەوە ڕاستە.

## بایەخدان بە نابینا

نەک هەر لای ئێمە دەزگایەک نیە بۆ ڕێکخستنی سەفەرو سەیرانکردن و گێران، بەڵکو گەر نابینایەک لەگەڵ کەسوکاری یاخود هاوەڵەکانیدا سەیرانێک بکات ئەوا بەسەدان قسەو قسەلۆک و توانجی لێ دەگرن کە ئەو لەکوێ و سەیران لە کوێ. ئیدی ئەو خەڵکە وا بیر دەکاتەوە کە مرۆڤێک نابینابێت یان پەککەوتە بێت ئەوا هەستیشی نابێت و دەبێت لە ماڵ بکەوێت و چاوەڕێی مردنێکی لەسەرخۆ بێت. خۆ گەر نابینایەک لە ڕێ بکەوێت یان بەڕێبێتەوە ئەوا لای مەزنەکانی خۆمان دەبێتە جێی پێکەنین و گەمەو گاڵتەپێکردن. ژیان وا دروست بووە: میللەتێکی دواکەوتووی مەزن لە ڕۆژهەڵات، لە ئەورووپاش میللەتێکی پێشکەوتووی سادەو هێمن. بەڵگەیەک لەوانەی کە لای خۆمان بە سووک و کەم تەماشای نابینایان دەکەن باس دەکەم: مەلا کەمال دەیگێڕایەوە کە ڕۆژێک لە ڕوداوێکی ئاینیدا گوێی لە هەندێک قسەی نێو ژنان بووە، جۆرە قسەیەک کە هەرگیزاو هەرگیز ژنانی کورد ورەی ئەوەیان تێدا نیە لای چاوساغێک باسی بکەن. بەڵام کە ئەو قسانەیان لە نزیکی مەلا کەمالەوە کردووە، پێیان وابووە کە مادام ئەو نابینایە ئیدی گرنگ نیە و هیچ حسابێکی گوێیان بۆ نەکردووە. ئەم جۆرە بێ بایەخی و بەکەم تەماشاکردنەی نابینایان لەلایەن گشتی خەڵکەکەوە پلەی شارستانی و کولتووریان بەدەر دەخات کە لە چ ئاستێکی بەرزدایە!



**وێنەی دڵزارو پایانی کچی لای ڕاستەوە، لەگەڵ هێمن میکاییلدا**

دڵزار حەوێزیی ساڵی ١٩٥٧ لە کۆیە لەدایک بووە. قوتابخانەی سەرەتایی لە کۆیە، هەولێر، کەرکوک تەواو کردووە. دوای ئەوەی ناوەندی و ئامادەیی لە شاری هەولێر تەواو کردووە، بۆ خوێندن و تەواوکردنی کۆلێجی ئیدارە هاتۆتە زانکۆی سلێمانی. ساڵی ١٩٧٩ دەبێت بە پێشمەرگە. ماوەی سێ ساڵ بەرپرسیاری دارایی (ی.ن.ک) بووە. دوای ئەوە دەبێت بە فەرماندەی کەرت لە تیپی ٩٠ باواجی. ڕۆژی ١٩٨٣/٤/٢٧ لە شەڕێکی ناوخۆدا، بە تەقینەوەی گوللەی ئار.پی.جی چاوی لەدەست دەدات. بە نابینایی دەگەڕێتەوە بۆ هەولێر. کەسوکاری هەوڵێکی زۆری بۆ دەدەن بینێرن بۆ ئەورووپا بۆ چارەسەر. بەڵام لە بەغداد، لە خەستەخانەی یەرموک، باوکی دڵزار ڕادەگرن و خۆی دەبەنە ژێرخانێکەوە. لەوێ باڵی دەخەن و دەرزییەک دەکەن بە چاوی چەپیدا. دڵزار دەڵێت: "*بە هەناسەیەک هەموو گیانم بوو بە ئاو، جنێوێکی زۆرم پێ دان، بەڵام ئەوان ئیشی خۆیان کرد بوو*". دڵزار دواتر کە دەگاتە ئەڵمانیا، لەوێ پێی دەڵێن: ئەو دەرزییە بۆ ئەوە بووە کە ئیتر بێ ئومێدی بکەن.
ساڵی ١٩٨٦ لە پەیمانگای نابینایان، لە هەولێر، دەبێت بە یاریدەدەری بەڕێوەبەرو بۆ ساڵێکیش بەڕێوەبەر. لە ساڵی (١٩٩٥)ەوە لە سوید دادەنیشێت. ئێستا لە بەشی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکانی "کۆمەڵەی نابینایانی کورد لە سوید"دا چالاکە.

# هێمن میکاییل، پیتی نووسین و خوێندنەوە دادەنێت بۆ نابینای کورد

## سەیرکە چۆن نابینایەک دنیا دەبینێت

## - ئەگەر بە هیوای بینینەوە بژیم، خۆم دەخەڵەتێنم

ساڵی ١٩٩١، شەش پێشمەرگە بووین کە چوینە سەر قوتەیەکی سەربازیی. ڕوممانیەک تەقی بەسەروچاوما. هاوڕێکانم دەریان کردم و دواییش بردمیان بۆ خەستەخانە. شەش پارچە لە سەرماو چواریش لە چاوما بوو. مانگی ٣ بوو، نەورۆزەکەی ئەو ساڵەشم بینی.
یەکەم خەستەخانە سلێمانی بوو. دوکتورەکە وتبووی نازی. بردیانم بۆ تاران. وردە وردە هۆشم هاتەوە سەرخۆم. لە پڕ تروسکایی دەهات بە چاوما، تروسکاییەکی سوور. زۆر دڵم پێی خۆش بوو. هیوایەکی گەورەی خستە دڵمەوە. خێرا بۆ دوکتۆرەکەم گێڕایەوە، بەڵام دوکتورەکە وتی: ئەوە هی چاوت نیە، شتی کۆنە مێشکت لێی دەداتەوە. هیواکەی کوژاندمەوەو دڵی تاریک کردم.
دوای ئەوەی هاتمە سوید دەستم لەو خەیاڵە شت کە من چاوەڕێی ئەوە بکەم جارێکی تر چاوم ببینێت. ئەگەر بەو هیوایەوە بژیم خۆم دەخەڵەتێنم. من بەتەما نیم جارێکی تر چاوم ببینێت. بەڵام هیوای خۆشم هەیەو بڕواشم بە ژیان زۆرە. من لێرەوە دەستم پێ کردەوە: من چاوم نابینێ و ئەبێت بشژیم. نابێت دانیشم بەدیار چاومەوە. مادام دەبێت بژیم، پێویستە ژیانێکیش بۆ خۆم دروست بکەم.
ڕۆژی ٩١/٧/١٢ لە کوردستان دەرچووم. ژمارەیەک کۆڵەواری شەڕ بووین کە نێردراین بۆ ئەڵمانیا. لەوێ باسی مەکتەبیان کرد، گاڵتەم پێ دەهات. مەکتەبی چی؟ خۆ من تازە کوێرم. چۆن من بۆ مەکتەب دەبم؟ نەم دەزانی مەکتەب و نوسینی زبر هەیە. فێرت دەکەن پیتی زبر بنووسیت و بە سەری پەنجەش بیان خوێنیتەوە. کە تێگەشتم دەرفەتێکی وا هەیە، یەکسەر دڵم گیرا. کوردم بیرکەوتەوە. لە دڵی خۆمدا دەموت؛ تۆ بڵێی ئەو هەموو نابینایەی کورد بێبەش بمێننەوە لەم تەکنیکە؟ تۆ بڵێی کورد نووسینی زبری هەبێت؟ ئەگەر نەبێت تۆبڵێی من بتوانم شتێکیش بۆ ئەوانی تر بکەم؟ لە مانگی (١٠)ی ساڵی (٩١)ەوە کەوتمە لەدووگەڕانی ئەم کێشەیە. ساڵی ١٩٩٦ بۆم دەرکەوت کە کورد خەتی زبری نییە و پێویستە پیتەکان دانێم و هەوڵی بڵاوکردنەوەیان بدەم.
پیتەکانم دانا و ناردمن بۆ زۆر شوێن. بەڵام ئەوە بەس نیە. ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە کە پیتەکان بکەوێتە بەردەستی نابینای کورد. قوتابخانەیان بۆ بکرێتەوە. شوێن هەبێت تیا بخەون و تیا بخوێنن. هەندێک هەوڵم لەم بوارەدا دەست پێ کرد.

ئێمە لە سوید ٨ کەسین. شەشمان لە شەڕدا چاوی لە دەست داوە. ڕەنگە ئەوانەی زکماکیی کوێرن، نەزانن چیان لە دەست داوە. بەڵام بۆ یەکێکی وەکو من وا نیە. هەندێک شت کە جاران دەمتوانی بیکەم ئێستا ناتوانم. کە خۆم دەکێشم بە شتێکدا یان کە یەکێک باڵم دەگرێت، برینم دەکولێتەوە. دەکەومەوە ئەوکاتەی کە چاوم لەدەست دا.
کە باسی ڕەنگ دەکەن من دەزانم شین چۆنە، یان کە دەڵێن فلانە کەس باڵای ئاوایە خۆم وێنەیەکی لێ دروست دەکەم. ئەوانەی کۆن دیومن شێوەیان هەر لەبەرچاومە. ئەوانەی پێشتر نەمدیوون هیچ شێوەیەکیشیان لای من نیەو خۆشم هیچ شێوەیەکیان لای خۆم بۆ دروست ناکەم. بە دەنگیانا جیایان دەکەمەوە. دەنگە پێم دەڵێت ئەو کەسە کێیە، دەنگ و ناو.

### کە دنیای بینین بۆ من نەما، دەبێت خۆم لەگەڵ نەبینیندا بگونجێنم

بە خەمخواردن هیچ شتێک ناگۆڕێت. خەم هەر ژیانەکە قورس دەکات. ئەو کاتەی دنیای بینین بۆ من نامێنێت، ئیتر دەبێت من خۆم لەگەڵ نەبینیندا بگونجێنم. خۆگونجاندنیش لەگەڵ ئەم دنیا تاریکەدا زۆر زەحمەتە ئەگەر مرۆڤ دەستی نەگاتە ئەو دەستیاوانەی کە بۆ ئەم دنیای نەبینینە دروست کراوە.
دەستیاو باشترین شتە. ئەم نوسینی زبرە زۆر گرنگە. هەم ئەرکت لەسەر خەڵک کەم دەبێتەوە هەم دەتوانیت خۆت دەربڕیت. کاتی خۆی کە پێیان وتم چاوت چاک نابێتەوە هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە خۆم بکوژم. بەڵام کە هاتمە ئێرە، بە هۆی ئەم هەموو دەستیاوەوە کە هەیە، ڕام گۆڕی. جیهانێک کە دەستیاوی تیا نەبێت و جیهانێک کە دەستیاوی تیا بێت، وەکو جیهانی مردن و جیهانی ژین وایە. جاران نەم دەتوانی دوو مەتر بڕۆم، ئێستا هەموو شار دەگەڕێم و پێویستم بە کەس نیە. ئێستا هەندێک جار وا هەست دەکەم کە ئەگەر چاوم چاک بێتەوە زۆر شتم لە دەست دەچێت.
ژیانی نابیناکانی کوردستان زۆر ناخۆشە، من لێیان تێ دەگەم.لە کاتێکدا خەڵک بیر لە شتی تر دەکاتەوە، ئەوان بیر لەوە دەکەنەوە چۆن بتوانن دوو سێ مەتر بڕۆن و خۆیان نەدەن بە شتێکدا. چۆن هەستن پەرداخێک ئاو بخۆنەوە.

کە دەزانم ئەوانەی دەورم هیچم لێ ناشارنەوە. من وام پێ باشە هەموو نابینایەکی تریش وا بێت.
من چاوم داخراوە بەڵام هەستەکانی ترم لە جاران زیاتر کراونەتەوە. جارێک خۆم و خێزانەکەم بەسەر پاسکیلەوە بووین. لە ڕێگا وتم: ئەوە شتێکت لێ کەوت. کە وەستا ٥٠ کرۆنی لێ کەوتبوو. جارێکی تر خێزانەکەم لە ماڵەوە بۆ سەعاتەکەی دەگەڕا، "من" پێم وت ئەوەتا لەوێدایە. جارێکی تر لەگەڵ برادەرێکی نابینای ترما خەریکی چاکردنەوەی پاسکیلەکەی ئەو بووین. پارچەی نوقسان بوو چوین بۆی بێنین. کە هاتینەوە وتم: ئەها! پاسکیلەکە لەوێ نەماوە. هاوڕێکەم وتی: ئەی چی لێهاتووە؟ وتم: وەڵا نازانم. کورەکە کە هاواری لە دایکی کرد، دایکی لە وەڵامدا وتی: من لام بردووە.

## کلێشەیەک کە چاوم لەسەر داناوە گرنگە بۆ من بزانم کەیشتۆتە کوێ

خەریکی پەیداکردن و کۆکردنەوەی شتومەکی وەکو گۆچان، تابیعە و سەعات بووم. کاتێک شەڕی ئەم حیزبانە دەستی پێ کردەوە زۆر دڵم گیرا. کە ئەم هەواڵە ناخۆشانە دەگات، ئیتر من دەستم ناچێتە هیچ. کلێشەیەک کە چاوم لەسەر داناوە، گرنگە بۆ من بزانم گەیشتۆتە کوێ!

نووسینەوەو چاوپێکەوتن: *ناڵە*

**١١/٦/٩٦ ئۆسلۆ.**



**وێنەی هێمن و "کاڵێ" ی خێزانی و "نارین" ی خوشکی و "هۆکان" ی کوڕی لە جۆلانەکەدا.**

---

## من ئەمەوێت ئەو دەقە بشکێنم کە بێچاوێک نەوێرێت باسی نابینایی خۆی بکات

لە ماڵەوە گرانییم نیە. نامەوێت کەس دەست لە شتەکانم بدات. کە خۆم دایان بنێم دەچمەوە سەریان، بەڵام کە لایان بەرن بۆم نادۆزرێنەوەو تووڕە دەبم. گوێم زۆر سووک و بە هێزە. ئەگەر پێم نەڵێت و دەست بدەیت لە دەستم زۆر بە خێرایی دەستم ڕادەکێشمەوە. ئەگەر بچمە دەرەوەو سەرم بدات بە دەرگاکەدا، وا بەخێرایی سەرم دەهێنمەوە دواوە خەریکە ملم بشکێت. لەم حاڵەتانەدا زۆر ئازارم دەگات. ئەگەر خۆم بۆ ئامادە کردبێت باشترە. سەرپەنجەکانم زۆر حەساسن. هەر شتێک کە پێشتر دەستم لێ دابێت دەیناسمەوە، بۆ نمونە؛ پەرداخ و قاپ. تەنانەت ئەو قسانەشم دێتەوە یاد کە لەو کاتانەدا کردوومن.

### من نابینم، بەڵام خۆشم بە کەم نازانم

باسی نەبینین بەلامەوە ئاساییە. لە ناخەوە پێم خۆشە و فەرامۆشیم دێ کە باسی دەکەم، بەتایبەتی کە لە پێناوی میللەتەکەمدا وام لێ هاتووە. لە گەڵ برادەری نزیکدا باسی بینین و نەبینین دەکەین. بەڵام قسەکردن لە گەڵ نابینایەک ئاسانترە. من ناترسم لەوەی باسی بکەم بۆ خەڵکی تریش. ڕاستە من نابینم، بەڵام خۆم بە کەم نازانم. من دەمەوێت ئەو دەقە بشکێنم کە بێچاوێک نەوێرێت باسی نابینایی خۆی بکات. هەندێک جار لە گەڵ خێزانەکەمدا زویرییم دەبێت لەسەر ئەوەی کە دڵی نایەت هەندێک شتم پێ بڵێت. من حەز دەکەم تێ بگەم. پێم خۆشە ئەو شتەی پێویستی بە چاوە بۆ منیشی باس بکەن یان پێم بڵێن. بریندار نابم ئەگەر یەکێک پێم بڵێت: شتێک بە ڕومەتتەوەیە. ئەو کاتە دڵشادم

## "لویس برایل" کێ بوو؟

لویس برایل بە دۆزەرەوە و داهێنەری زبرنووسین دادەنرێت. برایل، ساڵی ١٨٠٩، لە یەکێک لە گوندەکانی فەرەنسە لە دایک بووە و لە تەمەنی سێ ساڵیدا توانای بینینی لە دەست داوەو کوێر بووە. لە تەمەنی دە ساڵیدا لە ئامۆژگای نابینایان لە پاریس دەستی بە خوێندن کردووە. لەو ئامۆژگایەدا فێری خوێندنەوەی چەند سیستەمێکی جیاواز بوو کە لەو سەردەمەدا بۆ فێرکردنی نابینایان هەبوون تا بتوانن فێری خوێندن و نووسین ببن. فێربوونی ئەو جۆرە سیستەمانە بۆ نابینایان زۆر قورس بوو، لەوەش قورستر ئەوە بوو کە لەبەر بێدەرامەتی و نەداری پیتەکانیان لە جاران بچووکتر کرابوونەوە.
هەر لەو سەردەمەدا لویس برایل بە سیستەمێکی چقرەی سەربازیی ئاشنا بوو کە لە دوانزە نوختەی هەڵتۆقیو پێک هاتبوو. ئەم دوانزە نوختەیە پێکەوە سیستەمێکی تایبەتیان پێک دەهێنا. برایل لەگەڵ ئەو سیستەمەدا کەوتە کارکردن و ساڵی ١٨٢٥، لە تەمەنی شانزە ساڵیدا، ئەو سیستەمی شێوە زبرەی داهێنا کە ئێستا لە سەرانسەری دنیادا لە لایەن نابینایانەوە بەکار دەهێنرێت. ئەوەی تایبەتمەندیی بەم سیستەمەی برایل دەدات و لە سیستەمەکانی پێش خۆی جیای دەکاتەوە ئەوەیە کە بە هۆی بەکارهێنانی کەرەسەی زۆر سادەو ئاسانەوە، نابینا، دەتوانێت بەم سیستەمە بنووسێت.

تێبینی:
ئەم زانیارییە لە کتێبێکی ئامادەکراوی (هێمن میکایل)ەوە وەرگیراوە، کە بەم زووانە دەردەچێت.

# ئامار

- **گۆڤار زۆرەو زۆربەیان هیچ سوودێک ناگەیەنن**
- **بڵاوکراوە کوردییەکان ئاوێنەی میللەتە سەرلێشێواوەکەمانن**

**لەگەڵ ژمارەی پێشوودا ئامارنامەیەکمان ڕەوانە کرد بۆ بەشدارانی کۆنتراکت. ئەوانەی وەڵامیان دایەوە ٤٥ کەس بوون. وەڵامدانەوە گرنگیی ئەوەشی هەیە کە خوێنەران ڕۆڵیان هەبێت لەو شتەدا کە بەشداریی تیادا دەکەن. سوپاس بۆ وەڵامەکان. لێرەدا ئەنجامی ئامارەکە دەخەینە ڕوو.**

## زۆربەی پرسیارلێکراوەکان:

- **ڕۆشنبیران تا ڕادەیەکی کەم لە ئاستی مەسەلەو ڕوداوەکاندان**
- **نوسینی کوردی تا ڕادەیەکی کەم سەرچاوەی فێربوون و زانیارییە**
- **لەو نووسینانە تێ دەگەن کە دەیان خوێننەوە**
- **تا ڕادەی مامناوەندی لە شیعری کوردی ئێستا دەگەن**

١-چەند کارەساتێکی گەورە لەم مێژووەی کورددا ڕووی داوە، لەوانە: هەڵەبجە، ڕاپەڕین، ئەنفال، ڕەو، شەڕی ناخۆ و کوردستان جێهێشتن. ئایا بەڕای تۆ تا چ ڕادەیەک ***ڕۆشنبیران*** لە ئاستی ئەم مەسەلەو ڕووداوانەدا بوون؟

٤٪ : ڕادەیەکی زۆر.
٢٢٪ : مامناوەندی.
٥٥٪ : کەم.
١٨٪ : هیچ.

٢-بڵاوکراوەی کوردیی زۆر کەم دەفرۆشرێت. ڕایەکی باو ئەوەیە کە دەڵێن: خەڵکی کورد ناخوێنێتەوە! ڕای تۆ چییە؟

٤٤٪ : خەڵکی کورد ناخوێنێتەوە.
٤٧٪ : نووسینی کوردی بەگشتی خەڵک ڕاناکێشێت بۆ خوێندنەوە.
٩٪ : هۆیەکی تر.

٣-ئایا نووسینی کوردی بە بەراورد لەگەڵ زمانەکانی تردا، تا چ ڕادەیەک سەرچاوەی زانیاریی و فێربوونی تۆیە؟

١٦٪ : ڕادەیەکی زۆر.
٢٨٪ : ڕادەیەکی زۆر.
٤٨٪ کەم..
٨٪ : هیچ.

٤- ژمارەیەک بڵاوکراوەو دیوان لە دەرەوەی وڵات دەردەچن. ئایا بە گشتی خۆت لەبەردەمی کام لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەبینیتەوە؟

٤٪ کەس: من لە زمانی ئەو نووسینانە تێ ناگەم کە بەرچاوم کەوتوون.
٣٥٪ : بابەتی نووسینەکان سەرنج ڕاکێش نین.
٦١٪ : من لە زۆربەی ئەو نووسینانە تێ دەگەم کە بەرچاوم کەوتوون.

٥- لە بڵاوکراوەکانی دەرەوەی وڵات بە بەردەوامی کامیان دەخوێنیتەوە؟

ئەم پرسیارە وەڵامێکی تەواوی دروست نەکردووە، بەڵام ژمارەیەکی باش لە بڵاوکراوەکان لە وەڵامەکاندا ناویان هاتووە کە تیایاندا هەیە ئێستا دەرناچێت. لەوانە: ڕابوون، هەتاو، پەیام، سەکۆ، یەکگرتن، پەیڤ، کوردستانی نوێ، وان، هەڵوێست، گزنگ، ڕەهەند، ئاڤاشین، بێوار، مامۆستای کورد، بەربانگ، ڕوناکبیری، چرا، تێودەم، هانا، خەرمانە، کوردستان، مەڵبەند، خەبات، ژینی نوێ، کۆنتراکت.

٦-کۆنتراکت بڵاوکراوەیەکی نوێ یە. ئەم گۆڤارەت پێ چۆنە؟

٢٤٪ : زۆر باشە.
٦٢٪ : باشە.
١١٪ : مامناوەندی
٢٪ : خراپە.
سفر٪ : زۆر خراپە.

٧- بابەتەکانی "کۆنتراکت"ت پێ چۆنە؟

لە ڕووی زمانەوانییەوە:

٨٧٪ : زمانی نووسینی بابەتەکان ڕوونە.
١٢٪ : زمانی نووسینی بابەتەکان ڕوون نییە.

لە ڕووی ناوەڕۆکی باسەکانەوە:

٦٢٪ : باسەکان سەرنجڕاکێشن و زانستین.
٧٪ : باسەکان سەرنجڕاکێشن بەڵام زانستی نین.
١٥٪ : باسەکان نە سەرنجڕاکێشن و نە زانستیشن.
١٦٪ : شتێکی تر.

٨- ئایا تا چ رادەیەک لە شیعری کوردی ئێستا تێ دەگەیت؟
١٤٪ : رادەیەکی زۆر.
٦١٪ : مامناوەندی.
٢٣٪ : کەم.
٢ ٪ : بەدەگمەن.

٩- بڵاوکراوەی کوردی لە کام لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەدۆزیتەوە؟
٢٧٪کەس: سەرچاوەی زانیارین، نوێنەر و ڕێپیشاندەری دنیایەک و هوشیارییەکی پێشکەوتووترن.
٣١٪ : نە سەرچاوەی زانیارییین بۆ خەڵکی کورد، نە نوێنەرو ڕێ پیشاندەری دنیایەک و هوشیارییەکی پێشکەوتووترن.
٤٢٪ : شتێکی تر...

١٠-لەم سێ خاڵەی خوارەوەدا کامەیان لە لای تۆ بە پلەی یەکەم دادەنێیت کە لە نووسەرێکدا پێویستە هەبێت؟
١١٪ : زانیاریی، زمانزانیی، شارەزایی و هونەرمەندیی.
١١٪ : بڕوابوون بە نووسەرەکە کە ئەوانەی دەیان نووسێت و دەیانڵێت، لەگەڵ هەڵوێست و کردارەکانیاندا یەک پەیام بدەن.
٧٨٪ : هەردوو خاڵەکەی سەرەوە.

جگە لە ئەنجامی ڕێژەیی ڕاکان، هەندێک لە دەقی ئەو بۆچوونانەش بڵاودەکەینەوە کە بۆمان نووسراوە. دەربارەی بڵاوکراوەی کوردیی دەڵێن:
١- ئەگەر لە خزمەتی کورددا بن (نەک ئەحزاب) ئەوا خێریان هەیە.
٢- تینوێتیم دەشکێنێت و هەواڵ و ناو و وشەی کوردییم پێ ئاشنا دەکاتەوە!
٣- بە شێوەیەکی گشتی بڵاوکراوەی کوردی هیچ زانیارییەکی گشتی و هەمە لایەن نادەن بە مرۆڤ. بڵاوکراوە کوردییەکان ئاوێنەی میللەتە سەرلێشێواوەکەمانن.
٤- گۆڤار زۆرەو زۆربەیان هیچ سوودێک ناگەیەنن.
٥- ئەگەر ئەو خاڵە ڕاست بوایە، کە بڵاوکراوەی کوردیی سەرچاوەی زانیاری و نوێنەرو ڕێنیشاندەری دنیایەک و هوشیارییەکی پێشکەوتووترن، حاڵمان بەم ڕۆژە دەگەشت؟ یان کورد شت نابیستێت! هەمان کات شتی بەکەڵک هەیە بەڵام تیراژی کەمەو ناگاتە کوردستان کە ناوەندەکەیە.

# ئەنفال کۆن بووە!

حکومەتی سویدیی لە مانگی یەکی ئەم ساڵدا بڕیاری پرۆژەی بڵاوکردنەوەی زانیاریی دەربارەی تاوانی نازییەکان دا. یەکێک لە بەرهەمەکانی ئەم پرۆژەیە دەرکردنی کتێبێک بوو، کە بە چەند زمانێک لە سویددا، بە خۆرایی بەسەر ماڵەکاندا بەخشرایەوە. حکومەت لای وابوو کە گەنجەکانی سوید زانیارییەکی کەمیان دەربارەی ئەم کێشەیە هەیە. بۆچوونەکە وای پیشان دەدا کە ئاگادارکردنەوەو بیرخستنەوەی خەڵکیی دەبێتە هۆی ئەوەی کە نرخی دیموکراتی زیاتر بزانرێت، جگە لەوە خەتەری نازی و ڕەگەزپەرستیی پیشان بدرێت. ڕۆژنامەی داگنس نیهیتەر(DN)ی سویدیی، ڕۆژی ١٩٩٨/١/٢٨ نووسیبووی: *"جولەکەدژایەتیی و چەوسانەوە نەبەستراوە تەنها بە هیتلەرەوە. ئەو کەشوهەوایەش کە حوکمی دیکتاتۆریی هیتلەری بەرقەرار کرد، نەبەسترابوو تەنها بەو کات و شوێنەوە، پێش ئەویش هەبووەو ئەمڕۆش هەر هەیە".*
ئەوەی نازییەکان لە ئەڵمانیا بەسەر میللەتی ئەڵمانی و میللەتانی تریاندا هێنا، دوای نیو سەدە هێشتا لە سوید کۆن نەبووە. کەچی ئەنفال کە تا ئێستا خەڵکیی بە گشتی کەمی لێ دەزانێ و زۆر جار هەر ناوەکەی براوە، لە ژمارەیەک خەڵکەوە دەبیستین: "ئەمانە کۆن بوون". "کورد هەمووی دەیزانێ" ئەم خەڵکانە خۆیان کێن و بۆچی وا دەڵێن، شایەنی ئەوەیە قسەی لەسەر بکرێت. بەڵام پێشەکی دەتوانین بڵێین بێدەنگبوون و گیرسانەوە لە بەرەی تاوانکاراندا پێویستی بەوە نییە کە مرۆڤ لە قەومێکی تر بێت. لە کاتێکدا کە عەدنان مەکییەی عەرەب لە دەرەوەی وڵاتەوە دەچێت بۆ قوڕەتوو، بۆئەوەی لە شوێنەواری ئەنفالکراوەکانەوە بنووسێت، چەندەها نووسەری کورد هەن کە نەک هوشیارییان لەو ئاستەدا نییە، بەڵکو بۆ بەرەی غەدرو مافپێشێلکردنیش دەنووسن. ئێمە لامان وایە "ئەنفال" و "ڕۆژی حەشر" دەبێت چەندەها کتێب، سمینار، فلیم، ڕیپۆرتاج، پێشانگا، ڕێکخراوی لێ درووست بکرێت.
لە یەکێک لە کتێبخانەکانی شاری ئۆپسالەدا، هەر کە دەچیتە ژوورەوە یەکێک لە کتێبەکان، کە بە پێوە دانراوەو باسی کوشتاری جولەکەکان دەکات، بە چاودا دەچەقێت. لەسەر بەرگی کتێبەکە نووسراوە: *"مافی ئەوەمان نییە بیرمان بچێتەوە"*. لە کاتێکدا خەڵکێک مافی ئەوەی نییە کارەساتێکی مێژوویی بیر بچێتەوە، ئێمە بەگشتی مافی ئەوەمان نییە کە بیرخۆمانی بهێنینەوە. بۆیە ئاساییە ئەنفالێک کۆن بێ و چاوەڕێی ئەنفالێکی تازە بکرێت.

## کوردبوون ئاسان نییە

ئەنفال ئەوەیە کە ڕژێمی بەعس لە عێراقدا کردی و ڕۆژی حەشریش ئەوەیە کە خەڵکەکە بەسەری هات. تاوانەکانی ڕۆژی حەشر ئەوەندە گەورەن کە مرۆڤ تەنها بەخوێندنەوەشیان تەواو تەندروستیی ڕۆحیی تێک دەچێت. هەر یەکەمان کە بەسەرهاتەکان دەخوێنێتەوە، ماوەیەکی دەوێت تا دێتەوە سەر خۆی. دیارە بڵاوکردنەوەی ئەم کارەساتانە کاریگەریی لەو جۆرە دەکاتە سەر زۆربەی خوێنەران. بەڵام ئایا ئەوەی بەسەر ئەو خەڵکە هات ئێمە ئامادەش نەبین تەنانەت لەسەر کاغەزیش بیخوێنینەوە؟ ئەوە ڕاستیی باری ژیانی میللەتەکەمانە، ئەوە بەشێکە لە کوردبوون. ئەو کوردبوونەی کە شایانی ئەوە نییە کەس پێی ڕازی بێت. تۆ خۆت یەکێکی لەوانەی کە واتا دەدەمێت بە کوردبوون. ئایا باسنەکردنی ئەم کارەساتانە ترسی ئەوەی تێدا نییە کە ڕازیبوون و بەشدارییکردن بێت لەم دنیای ئەمڕۆی کورددا؟ خۆشە ئەگەر ڕێگایەکی تر هەبێت بۆ دنیایەکی تری کوردبوون، بەبێ ئەوەی ناچاربیت بەرەنگاری ئەم دنیایەی ئەمرۆ ببیتەوە. بەڵام کوانێ؟
کارەساتەکە هەر زوڵمـوزۆرەکە نییە، بەڵکو ئەوەشە کاتێک کە تۆ دەسەوسان دادەنیشیت و کارێک ناکەیت. ئەو دنیایەی تۆ دەتەوێت چاوەڕێ مەبە یەکێکی تر بۆت ئەنجام بدات.

**کــــــــــــــــۆنــــــــــــــــتــــــــــــــــراکــــــــــــــــت**

# بیابانەکانی خوارووی عێراقیان کرد بە گۆڕستانی کورد

## ئالان موحەمەد

### ئەنفالی چوار 3 – 8 /5/ 1988



ئەنفالی چوار ئەم ناوچانەی خوارەوە دەگرێتەوە :
دۆلی جافەتی، ناوچەی شوان، تەق تەق، ناوچەی ئاوی دوکان و نێوان شاری کەرکوک و سلێمانی .

### گۆپتەپە ناوێکی ترە لە ڕیزی هەڵەبجە

گۆپتەپە گوندێکی 500 مالی بوو، لە ڕۆژانی پێش ئەنفالدا دێبەرەکانی لۆکە، گەنم، توتن، گولەبەڕۆژە، پەتاتە، بامێ، باینجان، ترێ، قوخ، هەنجیر و شوتی بەبەرهەم دەهێنا.

1988/5/3 ڕۆژێکی بەهاری خۆش و بێدەنگ بوو. دەشت و دۆلە سەوزەکان بە گول و گولالەسوورە خەملی بوون . خەلکی ئاوایی خەریکی کاری ڕۆژانەی خۆیان بوون. ژنان خەریکی نان کردن و منالانیش لە ناو ئاوەکەی دوکاندا شلّپەیان دەهات. پێش ڕۆژئاوابوون، کاتژمێری (5:45)ی ئەو ئێوارەیە، هەشت فڕۆکە بێدەنگی سەر گوندەکە دەشکێنن و لە فڕکەی سینەمدا، بۆمبا کیمیاویەکانیان بەردەدەنە خوارەوە.

عەبدولا عەبدولقادر عەسکەری لەگەل فایەق و دیاری هاوڕێیدا لە سەر بەرزاییەک لەدەرەوەی ئاوایی دەبن و دەبینن کە چۆن (18) فڕۆکە لە ئاسمانی ناوچەکەدا دەبن بەسێ بەشەوەو گوندی گۆپتەپە، عەسکەر و ناوچەی هێزەکانی (ی،ن،ک) دەگرن و ناوچەکە کیمیاباران دەکەن. عەبدولا عەسکەری بە دەنگی بۆمبەکان و ڕەنگی هەورە ژەهراوییەکەی تێدەگات کە گوندەکەیان بەچەکی کیمیاوی لێدراوە. دوای ئەم ڕووداوە بەماوەیەکی کەم ڕاستەوخۆ خۆی دەگەێنێتە مالێ، کە ساتێ لەوە پێش بەجێی هێشتبوو. عەبدولا عەسکەری دەگێڕێتەوە: (...دنیا بەتەواوی تاریک بوو بەلام توانیم لایتێک بدۆزمەوە و بەدوای خێزانەکەمدا بگەڕێم...دایکم لەکەنار ڕوبارەکەی نزیک مالمانەوە کەوتبوو و دەمی لە قوڕەکە چەقی بوو. خستمە سەر پشت، دیم مرد بوو. حەزم کرد ماچی بکەم، زانیم ئەگەر بمکردایە ژەهرەکە لەمنیشی دەدا. تا ئێستاش لە کانگای دلمەوە پەشیمانم کە نەمتوانی بۆ دوا جار دایکە خۆشەویستەکەم ماچ بکەم. بەکەنار ئاوەکەدا ڕۆیشتم لاشەی کچە نۆ سالەکەم لەگەل کوڕەکەی مامیدا دۆزییەوە. هەردوکیان بەمردوویی باوەشیان بە یەکدا کردبوو. لاشەی برایەکم و کچەکەیم دی. زیاتر ڕۆیشتم لاشەی ئافرەتێکم دۆزییەوە بە منداڵێکەوە، کە هێشتا گیانی تیا مابوو، لەژێریدا دەینوزاند، منالەکەم دەرهێناو جلە ژەهراویەکانیم لە بەری داکەند. بەدەوری مالەکەماندا خولامەوە ، لە پانتایی (200 تا 300) مەترێکەوە لاشەی ژنەکەی خۆمم دی کەبەدەمدا کەوتبوو. هەروەها کەسوکارەکانی خۆم، لەوانە منالەکان، باوکم ، خوشک و براکانم و منالەکانیان، هەندێکیان هێشتا ڕۆحیان تیادامابوو.

هەست و هۆشم بەلای خۆمەوە نەمابوو. نەمدەزانی بۆ کامەیان بگریم و بۆلای کامیان بچم. شەو بوو بەتەنیا مابوومەوە . لاشەی یەکێ لە براکانم دی کە ژنەکەم لەلایەوە کەوتبوو هێشتا ڕۆحی تیامابوو. دوو کچەکەم شەش سال و چوار سالە لای دایکیانەوە بە مردوویی کەوتبوون. دەمجولاندن و ڕامدەوەشاندن بەلام جولەیان لێوە نەدەهات ،زانیم هەموویان مردوون.

کەسوکار و خێزانەکەم 40 کەس بوون. ئێستا لەو خێزانە گەورەیە تەنیا 15 کەس ماوین، 25 کەسی خۆشەویستم لەیەک ساتدا مردن. پێنج منالەکەم ، توانا تەمەنی 16 سال بوو، تابان 9 سال، تیشکۆ 6 سال، تاڤگە 4 سال، شۆخان 6 مانگ، دایکم ئایشێ عەبدولکەریم، کچی مامم، دوو براژنم عەتێ عبدولڕەحمان و پەروین سەید ئەحمەد..بەکورتییەکەی ئێستا 25 کەس لە خێزانەکەم مردوون و لە ژیاندا نەماون...).

لە گوندی گۆپتەپە 154 کەس دەکوژرێن و هەموویان لە نزیک سەرە نوێلکێکەوە ژێر چاڵ دەکرێن. منەوەر یاسین، ژنێکی 60 سالە دەگێڕێتەوە چۆن لاشەکان ڕەش و ڕەق بووبوونەوە، یەکێک لەوانە دایکێک و کۆرپەیەک بوون، لە کاتێکدا کە دایکەکە شیری بە منالەکەی دەدا.



(وێنەی گۆڕەکان لە گۆپتەپە)

## هێرشی سەر زەوی

10 هەزار تا 15 هەزار سەرباز و جاش بۆ گرتنی ئەوانەی نەکوژراون، لە دەشتەکانەوە هێرش دەکەنە سەر گۆپتەپە و عەسکەر و ناوچەکەی دەوروبەریان و تەوقی دەدەن. ڕۆژی 988/5/4، لە گوندی عەسکەر زیاتر لە 50 خێزان بەدیل دەگرن. عەبدولقادر عەسکەری پیاوێکی بەساڵاچوو، لەتیفی کوڕی بە بووراوەیی دەیگەیەنێتە گوندی مالمەشە. پاش سێ ڕۆژ، هێزەکانی ئەنفال تەوقی گوندی مالمەشەش دەدەن و گوندەکە تەخت دەکەن و خەلکەکەی بە دیلکراوی سواری ئیڤاکان دەکەن. مالمەشە تەخت کرابوو، بۆنی سووتاوی و دوکەڵی لێ دەهات. ئاڤان منالێکی کۆرپە دەبینێت، دایک، باوک، خوشک و براکانی دەکوژرێن. ئەم گاگۆلکێ دەکات کە جاشێک هەڵی دەگەڕێنێتەوە، بەلام لە دواییدا دەگاتەوە دەستی مامی.

## هێرشی ئەنفال لە دوانزە قۆڵەوە

ستراتیجیی هێرشی سەربازی ئەنفالی چواریش هەروەک ئەنفالەکانی تر دەبێت، ئەویش بە تۆپباران، کیمیاوی باران و تەوقکردن و هێرش بردنە سەر ناوچەکە لە هەموو لایەکەوە، لە هەمان کاتدا. چۆنییەتی هێرشەکە لە دەستنووسێکی سەرکردەی فرقەی یەک (سولتان حەسەن)دا دەردەکەوێت.

دوانزە سەعات دوای بە چەکی کیمیاوی لێدانی گوپتەپە و عەسکەر، لە کۆیەوە بە درێژایی ئاوی دوکان، لە سوسێ، چەمچەماڵ، تەقتەق و ناوچەی شێخ بزنگیان. هێزەکان هەموو ڕێگاوبانەکان لە دوانزە قۆڵەوە تەوق دەکەن. لە ڕۆژی 5/4 دا ناوچەی چەمی ڕێزان تەخت دەکەن. هێزەکان بەچڕی دەچنە پێشەوە، هەر گوندێکیان دێتە ڕێ، تالانی دەکەن، مالەکان یەک بەیەکی دەسوتێنن و خەلکەکەی بە دیلی دەبەن. 1680 کەس بەتەنیا لە شەش گوندی کلێسا، بۆگرد، کانیبی، قیزلۆ، کانی هەنجیر و گۆمەشین بەر ئەنفال دەکەون. گوندی گۆپتەپە جگە لەو 154 کەسەی کە لە جێدا کوژران، 500 کەسی تریشیان بەر ئەنفال دەکەون، بە سەدەهاش لە گوندەکانی گردخاپور، گلەمۆڕ، قەسرۆک و گۆمەشین دەچنە سەر لیستەی ژمارە نەنووسراوەکەی ئەنفالەوە. لە ڕاپۆرتێکی ڕۆژانەی فیرقەی یەکدا، نزیک بە تەقتەق، جگە لە 37 پێشمەرگە، 60 پیاو، 129 ژن، 396 منال گیراون و ناویان تۆمار کراون. ئەوانەی کە نەکوژرابوون، یان نەگیرابوون لە هەوڵی خۆ قوتارکردندا بوون.

ڕێگای خۆقوتارکردنەکەش دەچووە سەر گوندی قامیش. لەوێشدا هێزێکی گەورەی سەرباز و جاش چاوەڕوانی دەکردن. کە خەلکەکە کاتێک بە ماندوویی دەگەیشتنە گوندەکە، ئەمان تەقەیان بە سەردا دەکردن، لەوێدا پارە، ئاڵتون و هەرچی شتەبەنرخەکانیان هەبوو، بەتالانی لێدەسەندن و بەدیلکراوی خۆشیانیان ڕاپێچ دەکردن. بە هەزارەها خەلکی تر لە شاخ و لەناو ئەشکەوت و دارو دەوەنەکانەکاندا خۆیان شاردبووەوە، هێزەکانی ئەنفال دەوریان دەدەن و دوو کەسیان لێدەکوژن، بە دەستبەرزکراوەیی ئەوانی تر ڕیز دەکەن و لەوێدا پیاو و ژن جیا دەکەنەوە و دەیان بەن.

ئەو دوو سەرۆک جاشەی کە بەشداری ئەنفالی چوار بوون لە گوندی قامیش (بورهان شوانی وقاسم ئاغا ناسراو بە قاسمە کوێر) بوون.

## ( شوان ) یش دەکەوێتە ناوچەی سنووری ئەنفالەوە

ئەنفالی ئەم ناوچەیە لە گوندی دەلۆوە دەست پێدەکات. کاتی خۆی ئەم گوندە دووجار سوتێنراوە و تەخت کراوە. جاری یەکەم 1963 و دووەم جاریش 1976. ڕۆژی 5/5، هێزەکانی ئەنفال دەگەنە سەر گوندەکە و لە ئاسمانەوە بە هێلکۆپتەر دایدەگرنەوە و لە زەویشەوە بە هێزی تانک و پیادە هێرش دەکەنە سەری. زۆر کەس لە ناو مالەکانی خۆیاندا کوژران یاخود بە زیندوویی سوتێنران، یان کەوتنە بەر گوللەی تۆپەکان. بە پێی شایەتێک، کە دەگێڕێتەوە: "

هەر لە یەکەم ساتدا چوار پیرەژن و پێنج منداڵ بەرکەوتن. ئەوانەشی بە زیندوویش مانەوە، گیران و بۆ کوشتن بران.گیراوەکانیش 28 کەس بوون، لە ناویاندا 3 ژن و منداڵێکی بچوک".

**لە گوندی قالە کوتیا، کە پانزە دەقیقە لە دەلۆوە دوورە، تەنیا شەش پیرو مەلاکەیان بەر ئەنفال دەکەون. خەڵکی گوندی دارمەناو هەڵهاتبوون، لە کەل شاخەکەوە دەبینن کە چۆن سەرباز و جاشەکانماڵەکانیان تالان دەکەن و دواجاریش ئاگری تێ بەردەدەن. ئەمانە بۆ 12 رۆژ لە ئەشکەوتێکدا گیای کێوەکان دەخۆن. لە پاشاندا خۆیان بەسەر قاچی خەڵکی تەقتەقدا دەدەن و پێلاوەکانیان ماچ دەکەن تا داڵدەیان بدەن.**

## مەرکەزی کۆکردنەوەی ئەنفالی چوار

ئەو گوندییانەی کە دەگیران، بەلایەنی کەمەوە لە سێ شوێنی جیاوازدا کۆدەکرانەوە. زۆربەی خەڵکی گۆمەشین و گوندەکانی دراوسێی بۆ سەربازگای عەرموتە، کە دەکەوێتە دەرەوەی کۆیە،دەبران. ئەو گوندییانەی کە بە چەکی کیمیاوی لە گۆپتەپە، عەسکەر و گوندەکانی دەوروبەریدا نەکوژرابوون و بەرنەکەوتبوون، ئەمانیش بەدیلی بران بۆ (تەکێ). لەم مەرکەزانەشدا تەنیا 3 رۆژ گل دەدرانەوە. ژنێکی گوندی گۆپتەپە دەگێڕێتەوە کە کچەکەی، زاواکەی و 5 منداڵیان لە سەیارەیەکی سەربازیدا لە (تەکێ) دیوە. لە سەیارەیەکی تریشدا براکەیی و خێزانەکەی کە 12 کەس بوون. هەتاوەکو کچە گەورەکەیان چاولێ بووە کە چۆن گریاوە و هانای بۆ خەڵکەکە هێناوە تا رزگاری بکەن. کچەکە خزمێکی دەبینێت لێی دەپاڕێتەوە رزگاری بکات، بەلام ئەو نەیتوانی بوو یارمەتی بدات و هیچی بۆ بکات.

لە سەربازگەی ( ئەمیرییە)ش لە شاری تەقتەق، بە هەزارەها خەڵکی گوندەکان کۆکرابوونەوە. پیاوێکی پیری خەڵکی داربەڕو دەگێڕێتەوە کە چۆن ئەم لە کاروانێکی زیلی ئیڤادا لەگەڵ تالانی مریشک، مەڕ، بزن و مانگاکاندا هێناویانن. لە رێگا ژنێکی سکپڕ منالی دەبێت. لە سەربازگاکە خەڵکی گوندەکانی هاوسێی دەناسێتەوە، پیاوە پیرەکە دەبینێت ژن و پیاو لە یەک جیا کراونەتەوە، لە ژوورەکاندا خزێنراونەتە یەکتری. یەک شەو لەم شوێنەدا دەیان هێڵنەوە دوای ئەوەش دەیان بەن بۆ شوێنێک و چارەنووسێکی نادیار........ بەرەو ( ئەنفال ).

**لەبەر زۆریی خەڵکە گیراوەکانی گوندەکانی رۆخی دوکان، سەدەهایان خستبوونە ناو گەوڕ و بەرچی ئاژەڵەکانەوە. چەکدارەکانیش دەوری شوێنەکەیان گرتبوو. لە کاتێکدا کاروانێکی تر دەگاتە ئەو شوێنە، ژنێکی گەنج کۆرپەکەی توند بە سنگیەوە دەگرێت و لە یەکێک لە زیلەکانەوە باز دەدات و رادەکات. سەربازەکان لە دواوە تەقەی لێدەکەن، بەلام ئەم هەر خۆی قوتار دەکات. لەو هەراو قەرەباڵغییەی ئەو خەڵکە زۆرەدا، جاشێک لە دوو منالی خەڵکی قەسرۆک نزیک دەبێتەوە، عوسمان 11 سال و خوشکەکەی، بە گوێیاندا دەسرپێنێ کە فرسەت بهێنن و رابکەن. ئەم دوو منالە لە سەیارەی جاشێکدا، کە خواردنی بۆسەربازگەکە دەهێنا، دەشارێتەوە و دەربازدەبن، ئەوەش دواجار بوو کە عوسمان دایک و باوک و دوو براکەی و سێ خوشکەکانی ببینێتەوە، کە بچوکترینیان 3 سالە بوو، چونکە هەر لەوێدا کاروانێکی تری سەیارەی عەسکەری کە رێچکەیان بەستبوو، گوندییەکانیان تێ فڕێ دەدان و بە رێگا بیرۆکراتییەکەی پرۆسەی ئەنفال بۆ شاری کەرکوک دەیان بردن، لەوێشەوە بۆ بیابانەکانی خوارووی عێراق ودوا قۆرتی پرۆسەی ئەنفال و بە کۆمەڵ کوشتنیان.**

## چوار کەس لە ناو چاڵە لمەکانەوە دەگەڕێنەوە

(10) هەزار کەس لەناوچەی گەرمیان لە ژن و پیاو و منال بەر ئەنفال دەکەون. عوزێر، ئیبراهیم، عومەر و موستەفا چوار کەسن لەو شەش کەسەی کە لە کوشتنەکانی "ئەنفال دا خۆیان رزگار دەکەن و چیرۆکی پرۆسەی ئەنفالمان بۆ دەگێڕنەوە. هەر چواریان خەڵکی ناوچەی گەرمیانن. ئەم چوار کەسە لە هەمان کارواندا بەیەکەوە بۆ شوێنی کوشتن دەیان بەن. سێ کەس لەمانە لە هەمان ئوتومبیلی سەرگیراودا دەبن، دوانیش لەو سیانە یەکتری دەناسن. عوزێر کوڕێکی گەنجی 25 ساڵەی خەڵکی گوندی( **تەرجیل**)ی نێوان شاری کەرکوک و ناحیەی لەیلانە، دوا شەوی لە سەربازگەی تۆپزاوا بەسەر دەبات. عوزێر ژمارەی (375)ی لێدەدرێ و دەیخەنە ژوورێکەوە، بەنزین و خوێن لە ژوورەکەدا رژابوون. ئەو شەوە لە ترس و سەرمادا هەڵدەلەرزی، تا سەعات چواری بەیانی فرە فرێ سەیارەکان دەست پێدەکات، کە (1000-1500) کەس بۆ کوشتن دەبەن. عوزێر، کە لە سەربازیی رایکردبوو، تا مانگی (4)ی ساڵی 1987 هەتا ئەو رۆژەی لەشکر گوندەکە دەسوتێنێت، لە گوندی جافان خۆی دەشارێتەوە. دوای ئەوە عوزێر دەچێتە گوندی خدر رێحان کە بە پێ دوو سەعاتێک لە قادرکەرەمەوە دوورە. کاتێک هێزەکانی ئەنفال لە (4/10)لەو ناوچەیە نزیک دەبنەوە، ئەم رادەکات بۆ گردەکان. بە لێبووردنی گشتی دەخەڵەتێ و لە قادرکەرەم خۆی بە قاسم ئاغا تەسلیم دەکاتەوە، لەوێوە بەم بنکانەدا تێدەپەڕێت: قادرکەرەم _چەمچەماڵ، لە رۆژی 4/14 دەگاتە تۆپزاوا. لە دوا سەفەردا چارەنووسی لەگەڵ دوو کەسی تردا (عوزێر و عومەر) یەک دەگرنەوە. موستەفاش، کە 35 ساڵە، خەڵکی تۆپخانەیە وئیبراهیم 23 ساڵەوباوکی 4 منالە و خەڵکی گوندی کانی قادری خوارووە. موستەفا و ئیبراهیمیش بە هەمان شێوە، بە لێبووردنی گشتی

دەخەلەتێن و لە قادرکەرەم خۆیان تەسلیم کردبوو. هیچ کام لەمانەش پێشمەرگە نەبوون.

سەعات (8)ی بەیانییەک لە بەیانییەکانی (15 – 17) مانگی(4) لەگەڵ سەدەها کەسی تردا لە حەوشی سەربازگەکەی تۆپزاوا کۆیان دەکەنەوە. کاروانێک ئۆتومبێل، کە دەوری بە سەرباز گیرابوو، ئامادەکرابوون و خرابوونە ئێش، ریزیان بەستبوو. ئەوەی عوزێر، ئیبراهیم و عومەر کە سەفەریان پێکرد، پاسێکی سەرگیراوی پۆلیسیی بوو، کە 34 -35 کەسی دەگرت. ئەوەی موستەفاش 50 بۆ 60 کەس بوون. دیلەکان بەپێی ناوچەکانیان دابەش دەکران. عوزێر دەموچاوی هەندێک لە خەڵکی گوندی لەیلان، خدر بەگ، قەشقە و قەرەچێوار لەگەڵ دوو کەسی گوندەکەی خۆشیان (خدرڕێحان) دەناسێتەوە.

ئیبراهیم دەڵێت: تەمەنی ئەوانەی ناو پاسەکە لە نێوان 20 تا 40 ساڵە بوون. ناو پاسەکە وەک جەهەنەم وابوو، پڕبوو لە میز و پیسایی مرۆڤ. ئەوانەی پێشتر بەم پاسانە گوێزرابوونەوە بۆ کوشتن بە پەلە بە کوردی نووسیبویان " بۆ سنووری سعودیە، ....بەرەو سنووری کوێت"، ....بۆ عەراڕ".

## لە تینواندا میز دەکەنە پێڵاوەکانیانەوە دەیخۆنەوە

جێگای دیلەکان لەگەڵ جێگای دوو چەکدارەکەی پێشەوەدا بەدەرگایەکی بۆلبرینی ئاسنین جیاکرابووەوە. بەڕێکەوت کونێکی بچوک لە نێوان دیلەکان و شۆفێرەکەدا هەبوو، لەم کونە شەوە جیهانی دەرەوە و چارەنووسی خۆیانیان دەبینی. بەپێی قسەی عوزێر، ئەو لە پاسی ژمارە (35) دا دەبێت. بەگوێرەی سەرجەمی بۆچوونەکان ئەو کاروانەی بۆ کوشتن براون 1000 تا 1500 کەس بوون. هەروەها ئەم بە دزەچاو لە کونەکەوە پیکابی ئەمنەکان دەبینێت، کەبە چەکەکانیانەوە خۆیان دابەستبوو. لای پێشەوەی دیلەکان ئەنوەر تاهر ناوێک دانیشتبوو. ئەنوەر پیاوێکی تۆکمەو بەجەرگ بوو، لە کاتی خۆیدا پێشمەرگە بووە و وەک شۆفێریش کاری کردبوو، لەبەر ئەوە شارەزای ڕێگاکان بوو. هەر بۆیەش هاوڕێ دیلەکانی داوایان لێکرد کە تەماشای ڕێگاکە بکات و بزانێت بەرەو کوێ دەچن. ئەنوەر بە دزەچاو لە کونی پەنجەرە ئاسنینەکەوە تەماشا دەکات و دەڵێت بەرەو موسڵ دەچین. هەموو هەناسەی ترسیان هەڵکێشا. چونکە وەک ئیبراهیم باسی کرد زۆربەی کوشتنەکان لە موسڵ روویان دەدا. ئیتر دڵنیا بوون لەوەی کە بەرەو مردن دەچن. پاسەکە بەرەو لای خوارووی رۆژئاوا بای دایەوە. ئینجا ئەنوەر هەناسەیەکی ئارام هەڵدەکێشێت و دەڵێت" رزگارمان بوو". لەم کاتەدا دیلەکان وا بۆ مەسەلەکە دەچن کە دەبرین بۆ بەندیخانەیەکی تر. پاسەکان لە رۆیشتن بەردەوام دەبن، جارجارە نەبێت کە بۆ چەند دەقیقەیەک دەوەستن. پیاوەکان لە حەرەسی (القــواة الخاصــة)دەپاڕێنەوە بۆ قومێک ئاو، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە: **ئێستا ئاوتان دەدەمێ**. ئەو پاسەی کە موستەفای تیادا بوو، لە گەرما وبێهەوایی و بۆگەندا دیلەکان میز دەکەنە پێڵاوەکانیانەوە و دەیخۆنەوە. ئەمەش دوا ئاوخواردنەوەی پێش مردنیان بووە لەسەر زەوی.

دنیا بەرەو درەنگان دەچێت، ئیتر ئەنوەر لێی تێک دەچێت، نازانێت کاروانەکە بەرەو کوێ مل دەنێت. جارێک دەڵێت سەماوە، یەکێکی تریان دەڵێت فەلوجە. عوزێر دەڵێت: پێش فەلوجە کاروانەکە دەبێت بە دوو بەشەوە، زۆربەی سەیارە و پاسەکان ڕێگایەکی تر دەگرن. پێنج پاس و سەیارەیەکی گەورەی سەوزی سەرگیراو، کە موستەفای تیا بوو، بەرەو رووی خورەکە، کە زۆر بە خێرایی لە ئاوا بووندابوو، دەچن. کات نزیکەی شەش و نیوی ئێوارە دەبێت و 10 سەعات بەسەر دەرچوونیاندا لە تۆپزاوا تێپەڕیوە. بەشاری رومادیدا تێدەپەڕن و دوای ئەوە 15 تا 30 دەقیقەیەک بە جادەی قیردا تێدەپەڕن، تا لەسەر پردێک رادەوەستن. پردەکە بە سەربازێکی زۆر دەوری گیرابوو. لە کونەکەوە تەماشا دەکەن لەژێردار خورمایەکدا سەیارەکان لەبەردەم پۆلیسخانەیەکدا وەستاوە. گوێیان لە قسەی کابرای حەرەس و ئەفسەرێک دەبێت، کە لە پۆلیسخانەکەوە هاتبووە دەرێ. لێرەشدا دیلەکان تەسلیم بەم کابرا ئەفسەرە دەکرێن. حەرەسەکە لیستەی ناوەکان و سەیارەکان دەخاتە ژێر چاودێری ئەفسەرەکەوە و پێی دەڵێت" سەیارەکانیش لە تەکتاندا بن تا ئەو کاتەی لە کارەکەتان دەبنەوە و دەگەڕێنەوە. حەرەسەکانی (القواة الخاصة)کە لە سەیارەکان دادەبەزن و لە جێگایان چەکداری بەرگ سەوز و بێریەرەش، (کە ئەمەش جلوبەرگی رەسمی ئەمن و ئەندامی حیزبی بەعس بوو) دەچنە ناو سەیارەکانەوە. ئەفسەرەکەو چەندەها چەکداری تر خۆیان فڕێ دەدەنە دوو لاندکروزەری تویۆتاوە و دوو بلدۆزەریش لە تەکیاندا دەکەونە رێ.

## هەموویان دەست دەکەن بەگریان و یەکتر ماچکردن داوای گەردن ئازادی لەیەکتری دەکەن

دنیا بەرەو تاریکتر دەچوو. لێرەدا کاروانەکە دەبێت بە نۆ سەیارە و بلدۆزەرەکەش لە پێشیانەوە بە جادەیەکی چاڵاوی بە درێژایی فوراتدا دەڕۆن. پاش نیو سەعات کاروانەکە بەلای دەستی راستدا لا دەداتە سەر جادەیەکی خۆڵ. دیلەکان تەنیا هەر بیابان و تاریکییان دەبینی. هەندێکیان دەستیان کرد بە پاڕانەوە و شایەتمان هێنان. ئیبراهیم شێوەی خێزانەکەی بە مێشکیا تێ دەپەڕێت. ئیتر لەم کاتەدا هەموویان دەست دەکەن بە گریان و دەپرسن

چیان کردبوو وا رۆژیان بەم رۆژە گەیشت؟ سەرو ریشی یەکتریان ماچ دەکرد و داوای گەردن ئازادییان لە یەکتری دەکرد. ئەمەش خۆ ئامادە کردنیان بوو بۆ مردن.
دنیا تاریک ببوو. عوزێر، عومەر و ئیبراهیم دەربارەی ماوەی چەند بەو جادە خۆڵەدا رۆیشتوون، بۆچوونی جیاوازیان هەیە. عوزێر دەڵێت بە 10 دەقیقە، عومەر بە 15تا 30 دەقیقە و ئیبراهیمیش بە زیاتر لە 30 دەقیقەیەک دەخلەمێنێ.
لەپڕ پاسەکە لە قولایی لمدا دەچەقێت و سەیارەی دوا بەدوای ئەمانیش کە دوا سەیارە دەبێت، خۆی لادەدات و لەبەر دەم ئەماندا ئەویش دەچەقێت. عوزێر لە کونەکەوە دەبینێت کە 3 پاس، 2 لاندکروزەرەکە، کە یەکێک لە بلدۆزەرەکان بەردەوامە لەسەر رۆیشتن. لەبەر رووناکی لایتی سەیارەکاندا، لە هەڵبەزین و دابەزینەکاندا دەیتوانی سەری سەیارەکان ببینێت. کە کاروانەکە لایدایە سەر جادە خۆڵینەکە، ئەمان لە چارەنووسی خۆیان دڵنیا بوون کە بۆ مردن دەچن.
چەکدارەکان عەرەب بوون و لە زمانی کوردی تێنەدەگەیشتن. بۆیە ئەمان توانییان لە ناو خۆیاندا بکەونە مقۆمقۆ و رێبکەون لەسەر ئەوەی کە کاتێک دێن بیان بەن بۆ کوشتن بەرهەڵستی بکەن و هەوڵ بدەن ئەگەر یەکێکیش لەو 35 کەسە رزگاری ببێت زۆرە.

## وەستان بۆ سەرەی مەرگ

ئیبراهیم دەگێڕێتەوە: ماوەی بیست دەقیقە دیلەکان بەبەردەوامی گوێیان لە دەنگی دەستڕێژکردن و هاوارهاوار و لرفەی بلدۆزەرەکان بوو. دوای ئەوە بلدۆزەرێک لە تاریکییەوە بەرەو لای پاسەکەی ئێمە هات و جێگای خۆی وەرگرت، گێڕی گۆڕی و چەند جارێک هەوڵی دا کە پاسەکە لە چاڵەکە دەربهێنێت، بەلام پاسەکە زیاتر لە لمەکەدا ڕۆدەچوو. بۆ دوا جار توانی لە پێشەوە پاسەکە دەربکات. شۆفێرەکە دوای ماندوو بوونی لە هەوڵەکانی، لە بلدۆزەرەکەی دابەزی و مەتارەیەک ئاوی نا بەسەریەوە. دیلەکان لە دیوارە ئاسنینەکانی پاسە بێ پەنجەرەکەیان دەدا و بۆ چۆڕێک ئاو دەپاڕانەوە. شۆفێرەکە دوای مژێکی قوڵ، ئەوەی مابووەوە رشتییە سەر زەوی، ئاوەکە بەوشکایی لمەکەدا رۆچووە خوارێ.
بەهۆی دیلێکی خەڵکی گوندی خدر بەگ کە تەنیا کەس بوو توانیبووی سەعاتەکەی دەستی دەربکات، زانیمان سەعات 7 و نیوە. دنیا بە تەواوی تاریک ببوو. دوو جاری تر گوێیان لە دەستڕێژی گوللە و هاواری خەڵک بوو. پاش نیو سەعات، دوو لاندکرۆزەکە لەگەڵ ئەو ئەفسەرەی کە کاروانەکەی تەسلیم کرابوو گەڕانەوە. شۆفێری ئەو پاسەی کە عوزێری تیا دەبێت، دادەبەزێ و لە پشتەوە لایتی سەر پاسەکە دەکوژێنێتەوە و دەگەڕێتەوە و لایتی پاسەکە ئاڕاستەی پاسەکەی بەردەمی دەکات. عوزێر و هاوڕێکانی زیاتر تێک دەچن و دەشڵەژێن. سەربازەکان کە کلاشینکۆف و دەمانچەیان لە دەستدا دەبێت، 30 نەفەرەکەی ناوی دادەبەزێنن و لە بەر روناکی لایتی پاسەکەی ئەمانی تیادان، گوللە بارانیان دەکەن. کە لە کوشتنیان دەبنەوە رایان دەکێشنە ناو چاڵێکی تازە هەڵکەندراوەوە.
عوزێر دەبینێت کە چۆن چەند لاشەیەک هێشتا دەجولانەوە و گیانیان تیادا مابوو.

## ئێستا باری یەک پاس ماوە بۆ کوشتن

پیلانی دیلەکانیش بەم جۆرە بوو: کاتێک کە یەکەم سەرباز دێت بۆ بردنی دیلەکان، بەهێزترینیان پەلاماری چەکەکەی بدات و پێی لە دەرگاکە گیر بکات و بە کراوەیی بیهێڵێتەوە. دیلەکان چونکە چەندەها رۆژ بوو بێ خواردن و ئاو بوون، زۆر لاواز بوون تا بتوانن بەرهەڵستی تەواوەتی بکەن. بەلام بەهەر حاڵ عوزێر و عومەر و چەند کەسێکی تریان لە کاتی دەرگا کردنەوەدا توانییان خۆیان بۆ هەڵمەت بردن ئامادە بکەن. ئیبراهیم لە دواوە بە ترسەوە چاوەڕوانی دەکرد، ئامادە بوو تا ئەگەر توانی دەرپەڕێتە دەرەوە. عوزێر لە کونەکەوە تەماشا دەکات کە دوو چەکدار بە دەمانچەوە لە هەردوو لای دەرگاکەوە شوێنی خۆیان وەرگرتووە، سێهەمیان بە کلاشینکۆفێکەوە لە لای جێگای شۆفێرەکەوە وەستابوو. چوارەمیشیان، کە کلاشینکۆفێکی لە دەستدا بوو، پێیەکی لەسەر زەوی و ئەوی تری لەسەر پێپیلکەکە دانا و چاودێری دەکرد. پاش چەند ساتێک یەکێک لە سەربازەکان، کابرایەکی مل ئەستووری قەڵەو، قفڵەکە بەر دەدات و دەرگاکە بەرەو لای شۆفێرەکە رادەکێشێت. هەر لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکەدا سەلام ناوێک بە پەلامارەوە دەردەپەڕێتە دەرێ تا لە سەربازەکە بسرەوێنێت، بەلام سەربازی جێی شۆفێرەکە، بە دەمانچە سەلام لە جێدا دەکوژێت و دەرگاکەش دادەخرێتەوە. عوزێر گوێی لە **ئەفسەرەکە دەبێت کە دەڵێت: دەبێت یەکە یەکە بیان کوژم. عوزێر جڵەوی مەسەلەکە دەگرێتە دەست و دەڵێت: کاتێک کە سەربازەکان یەکەم کەس دادەبەزێنن، عومەر بە قورسایی لەشی خۆی بخاتە بەر سکەی دەرگاکەو نەهێڵێ دابخرێتەوە. پیاوەکانی تریش دەربپەڕنە دەرەوە و پەلامار بدەن و ڕابکەن. لە راستیشدا هەر وا بوو. سەربازە قەڵەوەکە هات، پەلی یەکێک لە دیلەکانی راکێشایە دەرەوە، بە پەرۆیەکی سپی چاربەستی کرد، لە کاتی بردنە دەرەوەی دیلەکەدا شەش حەوت کەس دەرپەڕین و چەند کەسێکیان پەلاماری کلاشینکۆفی سەرشانی سەربازەکەیان داو ئەویش**

مەخزەنەکەی گرتبوو. عوزێر هاواری یەکێکیان دەکات کە بە سەری ئەفسەرەکەدا بماڵن. کابرا لەبەر بێ ئاویی و بێ خۆراکی چەندەها رۆژ بێ هێز و توانا ببوو، بەلام تواتی چەپۆکێک بگەیەنێتە چاوی ئەفسەرەکە. عوزێریش تفەنگەکەی لە شانی فڕان، بەلام ئەو پێش ئەمە توانیبووی کە مەخزەنەکەی لێ بکاتەوە.

دەرگاکە والا بوو و دیلەکان دەردەپەڕن، لە هەمان کاتدا دەستڕێژی گوللە دەست پێ دەکات. دوو کەس بە کوژراوی بەسەر عوزێردا دەکەون. کاتێک عوزێر هەوڵ دەدات خۆی لە ژێر دوو لاشەکەدا رزگار بکات، دەبینێت یەکێک لەو چوار سەربازەی کە سەلامی کوشت بە شانی بریندارەوە، بەسکە خشکێ بەرەو لای ئەم دێت. کابرای سەرباز هاواری دەکرد (ابو سالح..)" واتە باوکی سالح" بگەرە فریام. دیار بوو کابرا بەر گوللەی هاوڕێکانی خۆی کەوتبوو. عوزێر دەستی بۆ دەمانچەی کابرا دەکوتا، بەلام دەستی نەدەگەیشتێ. لە جیاتی ئەوە دەست دەکات بە برینەکەی سەرشانیدا و لە ئەرزی توند دەکات و بێدەنگی دەکات، کابرای سەرباز لە هۆش خۆی دەچێ. لە هەمان کاتدا گوللە بارانکردنی پاسەکە بەردەوام دەبێت. لاشە لەناو پاسەکەو ژێر کورسیەکاندا کەوتبوون.

ئیبراهیم گوللەیەک بەر سمتی راستی دەکەوێت. عومەریش توانیبووی خۆی بگەیەنێتە ژێر پاسەکەوە. لە هەمان کاتدا لە هەر چوارلاوە گوللە باران دەکرا، عوزێر هەست دەکات کە تیغێک بەر قاچی کەوتووە، لە نێوان تەقەکاندا گوێی لە دەنگێکی نامۆ دەبێت. لە پێشدا نەیزانی ئەو دەنگە چییە؟ دوای ئەوە بۆی دەرکەوت کە لێشاوی خوێنە لەناو پاسەکە دەڕژێتە خوارێ. هەموو هاوڕێکانی دیکەی لەوێدا کوژران.

## موستەفاش خۆی قوتار دەکات !

کاتێک کە دوو سەیارەکە دەچەقن، سێ سەیارەی تر لە کاروانەکەدا، چەند سەد مەترێک لەمان دوور دەکەونەوە. موستەفا لە یەکێک لەم سەیارانەدا دەبێت. کوشتنی ئەمان زۆر کاریگەرتر بوو، کات ئێوارە بوو، چەکدارەکان دەرگای پێشەوەی سەیارەکەی موستەفا دەکەنەوە، بە دەستوچاوی بەستراو، دوو دوو رایان دەکێشنە دەرەوە. مستەفا لە ترساندا پێلاوەکانی، کە لەبەر گەرمی دایکەندبوو لەناو پاسەکەدا لەبیردەچێت، گوێی لە دەنگی گوللەباران و هاوار دەبێت کە لە چەند لایەکەوە بەرز دەبووەوە، بەلام لەبەر تاریکی هیچی نەدەبینی.

چەکدارەکان بۆ دواجار گیرفانیان دەپشکنن، بەلام ئەو دووسەد دینارەی کە لەناو لەشیدا شاردبوویەوە نایدۆزنەوە. لە پشتەوە بە پشتێنەکەی هەردوو دەستی و بە جامانەکەی خۆشی هەردووچاوی دەبەستنەوە، لەگەڵ هاوڕێیەکیدا ئەمریان پێدەکەن کە بڕۆن. مستەفا دەزانێت کە بەرەو مردن هەنگاو دەنێت، نزیکەی بیست هەنگاو دەڕوات هەست دەکات کە دادەچێتە خوارێ. دوای ئەوە ئەمریان پێ دەکەن کە لەسەر پشت بکەون. لەم حاڵەتەدا مستەفا هەست دەکات، کەوتۆتە بەینی هاوڕێیەکی و لاشەیەکەوە. گوێی لە دەنگی بلدۆزەرەکە بوو فڕە فڕی دەهات، دەنگێکی تر کە هاتە گوێی مستەفا، دەنگی گوللەکان و ناڵەی هاوڕێکەی تەنیشتی بوو، دەنگی تەقەکان تەواو دەبن و گوێی لە دەنگی پێی سەربازەکان دەبێت کە دەگەڕێنەوە بۆ هێنانی دیلی تر. گوللەکان مستەفای نەپێکا بوو . هەوڵ دەدات کە لابەلا خۆی تل بکاتەوە، بەلام زیاتر هەست بە لاشەی کوژراو دەکات. هەوڵ دەدات گرێی پشتێنەکەی دەستی بکاتەوە، لە هەمان کاتدا هەست دەکات کە سەربازەکان بە دوو دیلی ترەوە گەڕاونەتەوە سەر چاڵەکە. لە چاڵەکەدا ریزیان دەکەن و بە گوللە شڕیان دەکەن. دیسان دەگەڕێنەوە دوانی تر دێنن بۆ کوشتن. بەم شێوەیە دوو دوو لە زەویدا ریزیان دەکەن و گوللەبارانیان دەکەن.

ئەم جارەیان تا سەربازەکان دەگەڕێنەوە مستەفا دەتوانێت کە بەستەکەی چاوی بکاتەوە، دەبینێت کە لە ناو چاڵێکی گەورەدا راکشاوە. ئەمیش لەو لالێژەی چاڵەکەوە دەبێت کە بلدۆزەرەکە چاڵەکەی تیا هەلکەندبوو. تا چاوی مستەفا بڕ بکات هەر چاڵ بوو، کە بەسەدەها لاشە پڕ کرابوونەوە. ئەم شانۆیەی لەبەر رووناکی پرۆجەکتەری بلدۆزەرەکاندا دەبینی کە لای چاڵێکەوە وەستابوون و لە لرفە لرفی چاڵ هەڵکەندنی تردا بوون. چاڵەکەی کە خەریک بوو پڕ دەبوو لە لاشەو شۆفێری بلدۆزەرەکەش لەوە دەچوو چاوەڕێی ئەمر بکات بۆ سەرنانەوەی چاڵەکە.

مستەفا لە قەراغی چاڵەکەوە تارمایی سەیارەکانی دەبینی، کە بۆ ماوەی 15 دەقیقەیەک گوێی لە دەنگی تەقە و هاواری کوشتن دەبێت. دوای ئەوە بۆی دەردەکەوێت کە ناوچەی پشتی بێدەنگە، هەوڵ دەدات کە بەسەر ریزە لاشە خوێناوییەکاندا بە تل لە دەنگی گوللەکان خۆی دوور بخاتەوە. چاڵەکەی ئەمی تێدا بوو دوا چاڵ بوو لەو چەندەها چاڵانەی تر کە هەڵکەندرابوون.

ئێستاش بیابانێکی لە بەرەو دەبێت دەست بکات بە راکردن. بۆ هەناسە وەرگرتنێک نەبێت کە جار جار ناچار بوو بوەستێت، ئەگینا بەردەوام هەر رایدەکرد. سەگی هار بە بۆنی خوێن دوای دەکەون، ئەمیش بە بەرد دەیان رەوتێنێ. مستەفا لە سەر روبارێک جلە خوێناوییەکانی دەشوات.

دوای کوشتاری ناو پاسەکە، عوزێر توانی لەو تاریکییەدا خۆی بدزێتەوە و بۆی دەرچێت. لەیەکێک لە چاڵەکاندا کە دەکەوێتە ناوی بەسەر لاشەی پیاوێکدا دەکەوێت کە هێشتا گیانی تیا مابوو، خوێن لە لوتی دەرژا، چاڵەکە نزیکەی 400 کەسی تیادا کوژرابوو. بۆ ماوەیەک بەشڵەژاوی و رقەوە رادەکات. لە ترسی ئەوەی نەناسرێتەوە کە کوردە، جلەکانی دادەکەنێت و بەتۆپەڵکراوی لە سەر شانی دادەنێت و دەست دەکاتەوە بە راکردن، ئەمیش وەک موستەفا پێڵاوەکانی لەبیر دەچێت. بۆ ماوەیەکی زۆر چەندەها سەعات رادەکات. عوزێر دەڵێت: "ناوچەکە هەمووی چاڵ و بە گڵ هەڵدرابووەوە. چاڵەکانیش بە لاشەیەکی زۆر پڕکرابوونەوە. من رام دەکرد، چاڵەکانم بە بۆنی لاشەکاندا دەناسییەوە".

لە شوێنێکدا جادەیەکی قیر دەبینێت. دەگاتە سەر ئاوێک، لەو بەرەوە تارمایی ریزە دارخورمای لێوە دیار دەبن. ئەم بەچۆکدا دێت و دەچێت ئاو بخواتەوە، لەو کاتەدا لایتی سەیارەیەک دەبینێت، وا دەزانێت کە یەکێکە لە لاندکرۆزەکان و دەست دەکاتەوە بە راکردن.

بە بۆچوونی عوزێر کاتژمێر چواری بەیانی دەبێت، کاتێک چرای خانوو دەبینێت و بەرەو روناکییەکە مل دەنێت.

## ئۆردوگا زۆرە ملەکەی "ئەڵتەش" لە رومادی

عوزێر دەبینێت خەڵک لە حەوشە نوستوون، ماڵ بەماڵ لە دەرگا دەدات و دەپاڕێتەوە: پیاوێکی لێقەوماو و هەژار پێویستی بە نان و ئاو و یارمەتییە. کە خاوەن ماڵەکان دێنە دەرێ و عوزێر بەو شێوەیە دەبینن، دەرگاکەی بەسەردا دادەخەنەوە و دەری دەکەن.

لە ماڵێکەوە، پیاوێک و دوو کورەکەی بە دار بۆی دێنە دەرێ. عوزێر چیرۆکی بەسەرهاتەکەی لە دەم دەردەچێ، ئەوانیش شۆرباو نان و ئاو و جوتێک نەعلی دەدەنێ، لەو دەموچاوە شڵەژاوەی کوردێکی وەها راکردوو، دەترسن و دادی نادەن. عوزێر ماڵ بە ماڵ دەگەڕێت و دەپاڕێتەوە. ئەحمەد ناوێک بە هانایەوە دێت، رێی سوار بوونی پاسی پێ نیشان دەدات.

موستەفاش وەک عوزێر رێی دەکەوێتە سەر ئەم شوێنە، نزیک ماڵێک بۆنی نانی گەرم دەکات. دەبینێت ژنێک دانیشتووە، خەریکی نان کردنە. موستەفا لە ژنەکە دەپرسێت: ئەم شوێنە کوێیە؟ ژنەکە وەلامی دەداتەوە دەڵێت: کە ئەمە کۆمەڵگایەکی زۆرە ملەیەکە کوردەکانی ناوچەی قەسری شیرینی تیادا کۆکراونەتەوە. بەلام ژنەکە خۆی خەڵکی خانەقین دەبێت.(لە سەرەتای جەنگی ئێران و عێراقدا، 30 هەزار کورد لەم شوێنەدا دەستبەسەر کرابوون. بە پێی راپۆرتی خاچی سوور لەساڵی 1992دا کە (**Middle East Watch**) ئەم بەڵگەنامەیە و چاوپێکەوتنەکەش لەگەڵ عوزێر و ئیبراهیم و عومەردا تیادا ئامادەکردووە و لەگەڵ ئەو لێکۆڵینەوانەش لە سەر ئەنفال، 15تا 16 هەزار کوردی دەستبەسەر لەو شوێنەدا مابوون).

کاتێک پیاوی ماڵەکە لە شار دێتەوە، موستەفا چیرۆکە کە بۆ ئەمیش دەگێڕێتەوە، کە گوایە کارمەندی میرییە و سەیارەکەی وەرگەڕاوە. خاوەن ماڵ جوتێک نەعلی ئەداتێ و شوێنی وەستانی پاسی شاری رومادی نیشان دەدات. کە موستەفا دەگاتە شوێنەکە، پاسەکە لە رۆیشتندا دەبێت، ئەم بە دەستبەرز کردنەوە، پاسەکە دەوەستێنێت و سوار دەبێت.

## موستەفا یەکێک لە نەفەرەکان دەناسێتەوە

کە موستەفا سواری پاسەکە دەبێت دەموچاوی یەکێک لە نەفەرەکان دەناسێتەوە، ئەو کەسەش عوزێردەبێت. هەردووکیان" عەوێز و مەستەفا" بەیەکەوە دەگەنە بەغداد. مەستەفا لە بەغداد، لە قەرەباڵغی گەراجدا، شێوەی یەکێک دەکات، کە ئەفسەری ئیستیخبارات بووە لە تۆپزاوا. لە ترسا رادەکات و لە ناو قەرەباڵغییەکەدا خۆی ون دەکات.

## عوزێر لە تەلەفیزۆندا خۆی دەبینێت!

عوزێر ئەو ئێوارەیە دەگاتە کەرکوک، لە ماڵی خزمێکی تەماشای بلاوکراوەی دەنگوباسی تەلەفیزونی عێراقی ئەو ئێوارەیە دەکات. دەنگوباسەکە دەڵێت: کە سەربازی عێراقی بەکرێگیراوی ئێرانییان گرتووە. ڤیدۆ و فلیمەکە کە لە پۆلیسخانەی قادرکەرەمی ناوچەی گەرمیان لە (4/10) دا گیرابوو، نیشان دەدات کە چۆن سەربازی عێراقی بە چەکەکانییانەوە دەوری گیراوەکانییان داوە، کە عوزێر یەکێک دەبێت لەم گیراوانە.

هەر یەک لە ئیبراهیم و عومەریش، خۆیان قوتار دەکەن و لە بیاباندا رادەکەن و ئەمانیش رێگایان دەچێتەوە سەر هەمان شوێنی گۆمەڵگا زۆرەملەکەی " ئەڵتەش".

ئەم کەسانەی کە بە هەر سێ قۆرتەکەی ئەنفالدا دەڕۆن و بەم شێوەیە لە کوشتنی **ئەنفال** رزگاریان دەبێت، کۆتایی چیرۆکەکەیان نییە، بەڵکو بە چەندەها کۆسپ و مەترسی تردا رۆیشتوون. هەر یەک لە عوزێر و عومەر دواجار بە سەربازی دەبرێن بۆ جەنگی کوێت.

**ئەنوەر تاهیریش یەکێک دەبێت لەوانەی کە لە کاتی گوللەباران کردندا چوار گوللەی بەر دەکەوێت و جێی دەهێڵن. بە بریندارییەوە خۆی دەگەیەنێتەوە نیشتیمانەکەی. ئەو پێشمەرگەیەی کە ئەنوەری بۆ دوا جار لە ژیاندا، لە ناوچەی قادرکەرەم بینیبوو، دەڵێت: " لەوانەیە ئەنوەر لە برساندا مردبێت، یان لە لایەن لەشکری عێراقییەوە گیرابێت و کوژرابێت**

کورتەی بەسەرهاتی ئەو چوار کەسە لە کوشتنەکانی ئەنفال، لە ساڵی 1992دا لایەن **Middle East Watch** ئامادەکراوە. سەرچاوەی نووسینی ئەم جارەشمان بە کوردی هەر لە هەمان سەرچاوەیە:(ل 169-190 و ل 202-24)
وێنەکانیش لە کتێبی: **Kurdistan In the shadow of History** نووسینی:Susan Meiselas وەرگیراون)

******* ئەمەش بەسەرهاتی یەکێک لە هەزاران خەڵکی ئەنفالکراوی کوردە *******

# "بۆ ئەم منداڵە لە من ناترسێت"؟


"م. بلند" باشووری کوردستان

ئامادەکردنی: "هەرێم جاف"


لە دالانەکەدا دانیشتبووم، بیرم لە چارەنووسی خۆم و بێدەستەلاتی گشت زیندانییەکان دەکردەوە، لەپشتمەوە ترپەی پێیەک رای چڵەکاندم. کە لام کردەوە، پیاوێکی چاوشینی ریش سپی بالابەرز لێم نزیک بووەوە. پاش سڵاوکردن چەمایەوە و لەتەنیشتمەوە لەسەر زەوییە رەق و تەقەکە دانیشت.

**- ناوم عەونییە، خەڵکی گەرمیانم.**

*- سەرچاوم هاتی خاڵۆ عەونی.*

**- باوکەکەم راستە خەڵکی هەڵەبجەن؟**

*- بەڵێ.*

**- بۆچی هێناونیان بۆ ئەیرە؟**

*- پاش کیمیاوییەکە، ئەمان توانی لە ئۆردوگاکانی ئێراندا هەڵبکەین، لەبەر ئەوە بە چاکمان زانی بگەڕێینەوە کوردستان.*

**- کوڕەکەم خۆزیا بەخۆزیایی خوا ئێمەش بە ماڵ و منداڵەوە لە سەر خاکی خۆمان کیمیاوی بیکوشتباین.**

*- وا مەڵێ خاڵۆ گیان، ئەوەی لە ئێمە روویدا یاخوا نە لەئێوە و نە لەهیچ مرۆڤێکی سەر ئەم زەوییەش روو نەدات. ئەی ئێوەیان بۆ هێناوەتە ئێرە؟*

**- داخم گرانە رۆڵە!... کوڕەکانم هەر پێنجیان ژنیان هێنابوو. کچەکانم هەردووکیان شوویان کردبوو. بە گشتیان خاوەنی 43 منداڵ بوون.** لەپڕ رۆژێک جەیش و جاش بەسەرکردایەتی "عمید بارق" دەستییان کرد بە تەقە و بۆردومانکردن. گشتمان شپرزە بووین و منداڵەکان هەموو بە کوڕ و کوڕەزاو کچ و کچەزاوە روویان کردە شیوی بەردەم ئاواییەکە، کە بۆ رۆژی تەق و توق و تەنگانە لەوێدا پەناگەیەکمان تیا درووست کردبوو.

تەقە کەم کەم زیادی کرد تاکو هەموویان بەرەو پەناگەکە رۆیشتن، بەلام من و سەلمای ژنم ووتمان پیربووین و کەس لاقەی ئێمە ناکات، بۆیە لەناو ماڵەکەدا ماینەوە.

بینیم کایەتی ماڵەکەمان دەسوتێ. منیش بۆ رۆژی رەش هەندێک پارەم لەوێدا شاردبوویەوە، خێرا رامکرد تا دەریکەم. لە ژێر بنمیچی کایەنەکەدا منداڵێکی تەمەن چوار سالم بینی بەسلەمینەوە لەناو چڕە دووکەڵدا بەکوڵ دەگریا و هەنسکی دەدا و ئاگرەکەش خەریک بوو لێی نزیک دەبوویەوە. ئیتر لە سۆزی گیانی ئەو منداڵە پارەکەم لەبیر چوویەوە، بەهەڵمەت باوەشم پێدا دا و لە ئامێزم گرت. لەم کاتەدا سەیری شیوەکەم کرد، دیم جەیش و جاشەکان پەناگاکە دەدەنە بەر ئاربیجی و دەستڕێژی گوللە. پاش ماوەیەک بەنزین و نەوتیان پیاکردن و ئاگریان لە گیانیان بەردا.

ئا لەو کاتەدا مەرگ و سووتانی هەموویانم بەچاوی خۆم بینی. لەپڕ چەند سەرباز و جاشێک مۆڵەیان دام و بە چمکی فەقیانەکەم کێشیان کردم بۆ نزیک ئیڤایەک، سەرم بەرز کردەوە بینیم ژنەپیرەکەی خۆشمی تێدابوو.

چەند ویستیان منداڵەکەم لێ بسەنن، بەلام من نەمدانێ و هەڵم دایە ناو ئیڤاکەوە. سەلما خێرا گرتییە ئامێز و منیشیان سەرخست. لەناو ئیڤاکەدا رایان گرتین تاکو ئاگریان لە سەرتاپای ئاوایی بەردا. پاشان لەتەک چەند پیرو پەککەوتەیەکی تری گوندەکەماندا بردینیان بۆ چەمچەماڵ و لەوێش داوای منداڵەکەیان کرد بەلام سەلما هەرچۆن بوو شاردییەوە.

رۆژی دوایی بردینیان بۆ تۆپزاوای کەرکوک و لەوێش سێ رۆژ ماینەوە. لەو ماوەیەدا کەمێک هاتینەوە سەر خۆمان. ئەو ساتە زانیم منالەکە کوڕەزامە و هی سێهەمین کوڕمە، ئیتر بۆنی هەموویانم نا بەم منداڵەوە. ووتم: سوپاس بۆ خوا یەکێکیانم بۆ دەرچووە، ئەم لەشە بچکۆلانەیە کەمێک سوکنایی دڵم دەداتەوە.

خۆراکمان سەموتی رەق بوو، دەبوایە تەڕم بکردایە بۆ ئەوەی بخوسێت و منداڵەکە بتوانێت بیخوات. خۆمان دڵمان گیرابوو نەمان دەتوانی هیچ بخۆین. دوای سێ رۆژەکە بردینیان بۆ سەماوە هەر ئەو رۆژە هاوردینیان بۆ ئەم زیندانە لەم بیابانەدا.

لێرە ئیتر من بوومە دایک و باوک بۆ ئەم منداڵە، رۆژی تەنیا رۆژی یەک سەموتمان هەبوو بۆ خواردن. کە منداڵەکە برسی دەبوو، ناچار پەنام دەبردە بەر سەرئاو و لەوێ

دەگەڕام بووایە یەک دوو سەمووونی کۆن و کەڕووایم دەدۆزییەوە. ئەوجا بە چەقۆیەک دام ئەتاشی تاکو پیسیی و کەڕووەکەییم لێدەکردەوە، بە ئاو کەمێک تەڕم دەکرد و دەمکردە خواردنی ژەمێکی منداڵەکە. خۆشم تەنیا لەتەسەمونێکم کەرت دەکرد بە سێ بەشەوە و بە سێ ژەم دەم خواردن. هێشتا بەم ژیانە رازیبووم، چونکە ئەم منداڵەم لەگەڵدا بوو، وام دەزانی هەموو کوڕەزا و کچەزاکانم لەگەڵدان.

رۆژێک گەرما زۆری بۆ هێنابن، منداڵەکەم بردە بەردەم تانکی ئاوی حەوشەکە بۆ ئەوەی دەستێکی تەڕ بە دەموچاویدا بهێنم، کاتێکم زانی ملازم حەجاج لە ژوورەکەیەوە کە بەسەر هۆڵەکانی زیندانەکەدا وەک دیدەبان دەیڕوانی، بەدی کردین و نەڕەی لێ هەڵسا. ترس شلەژاندمی و رامکردە دواوە و خۆم تێکەڵی زیندانییەکانی تر کرد، بەڵام فریای منداڵەکە نەکەوتم و جێم هێشت. حەجاج بۆی هاتە خوارێ. ساتێک بەیەکیاندا روانی، ئەو لەشە بچکۆلانەیە لەبەردەم هاواری عەنتەرێکی دێزدا خۆی نەگرت و دایە پرمەی گریان. حەجاج لێی نزیک بوویەوە و دەنگی بەرزتر دەکردەوە و هاواری کرد:

- ئەمە *منداڵی کێیە*؟" دووبارەی کردەوە: "ئەمە سەگی کێیە؟".

دەروونم داخ بوو خەریک بوو سونیم دەبوویەوە، پێم بە جەرگی خۆمدا نا و ووتم:

- گەورەم منداڵی منە!

- *بۆچی دەگری و بێدەنگ نابێت؟* بۆ ناترسێت کە من دەبینێت؟

- قوربان منداڵە و لە هیچ تێ ناگات.

لەم کاتەدا کێبلەکەی دەستی بەرز کردەوە و بە هەموو هێزێکی و بەدەم جوێندانەوە کێشای بە پشتی ئەو بەستەزمانەدا و تەختی زەوییەکەی کرد. بەوەشەوە نەوەستا تاکو بۆی کرا بە پۆستاڵەکەی، لەقەیەکی دا بە دەمیدا و سەری چەقانە ناو قوڕە چڵکاوییەکەی لای تانکی ئاوەکەوە.

خاڵە عەونی بە چاوی پڕ فرمێسک و وشە پچڕپچڕەکانییەوە وتی:

- **مەرگی ئەم.م م م منداڵەشم بەچاوی خۆم بینی** ◇



**ئەم وێنەیە چیت پێ دەڵێت؟**

سەربازی کورد ئەمڕۆ لەگەڵ سەرۆکی ئەم ئەفسەر و سەربازە عێراقییانە دادەنیشێت، کە بەشانازییەوە وێنە لەگەڵ لاشەیەکی بێ سەری کوردێک دەگرن و سەرکەوتنی خۆیان نیشان دەدەن.

کێ بەرامبەر ئەو مێژووە بەرپرسیارە؟ ئەوانەی تاوانەکەیان کردووە یان ئەوانەش کە دەست دەخەنە دەستییانەوە؟

ئەم وێنەیە لە کتێبی: Kurdistan In the shadow of History وەرگیراوە

نووسینی: Susan Meiselas

**گۆڤاری کۆنتراکت، دەرامەتی تەنیا ئەو پارەی هاوبەشی و یارمەتی دڵسۆزان و دەستەی بەڕێوەبەرانێتی. بۆیە ئەوەی کە تا ئێستا پارەی ژمارەکانی پێشوویان بۆ نەناردووین، ئیتر لەم ژمارەیەوە گۆڤارەکەیان بۆ نانێرین.**

**دەستەی بەڕێوەبەرانی کۆنتراکت**

# ئەوانەی کوردستان بەجێ دەهێڵن دەڵێن چی؟

## بەهمەن و زانا و مەمۆ سێ کەسن لەوانە

**پایز**
**ئامادەی کردووە**
١٩٩٨.٦.٢١

**مەمۆ:**
**تاکەی مۆمی تەمەنم**
**لە بێمانابیدا بسوتێت؟**
**دە ساڵ شەڕی عێراق و ئێران،**
**حەوت ساڵیش شەڕی حکومەتی**
**سەوزو زەرد،**
**باشە پێتان وایە من چەند ساڵ دەژیم؟**

چیرۆک و بەسەرهاتە ڕاستەقینەکان هەر لە کوردستان و لە شارەکانی (سلێمانی، هەولێر، دهۆک) و شارۆچکەکانی دەوروبەرەوە دەست پێ دەکات. لە هەر یەکێک لەم شارو شارۆچکانەدا بە ئاشکرا یان کەمێک نهێنی بازاڕی دۆلار شانبەشانی بازاڕی تەزویر و بازاڕی قاچاخچێتی و کڵاولەسەرنان هەیە. ئەم بازاڕانە ڕێگا خۆشکەرو هاندەرێکی چاکن بۆ ئەوەی ڕاکردن و کۆچڕەوەکان بەڕێ بکەون. کۆمەڵێک دەڵاڵ و تەزویرچی بە هاوکاری پیاوەکانی ئاسایش و پۆلیسی ناوخۆ لەم بازاڕانەدا کار دەکەن. چاکترین پارەوپول بە شێوەیەکی ناشەرعی کۆ دەکەنەوە. بەڵام بڕیاری ڕاکردنەکە لە لایەن خەڵکەوە لە نێو هەناوی بارو زروفی وەکوڵ هاتووی کۆمەڵگای کوردستانەوە سەر دەردێنێت. ئەو خەڵکەی کە بڕیارەکە دەدا ئەگەر پارەیەک شک ببات یا ئەگەر کەسێک بەڵێنی یارمەتی و دەسگرتنی بداتێ، ئەوا بۆ دەربازبوون لە دۆزەخە ناهەموارەکەی ئەوێ، بە کڕینی ناسنامە، پەساپۆرت، بەڵگەنامەی تەزویرکراوو پارەی ئێرانی، تورکیی، ئەمریکیی خۆیان ئامادە دەکەن. قوناغی دووەم هەڕاجکردن و هەرزانفرۆشیی خانوو، ئوتومبیل، دوکان، کەلوپەل و هەرچی شک دەبەن. لە زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کوردستان بازاڕی هەڕاجکردن گەرمەو کۆمەڵێک دەڵاڵ و قۆڵبڕ لەسەری دەژین.

دوو ڕێگای ڕاکردن هەیە. یەکێکیان بە ڕەسمی و لە ڕێگای "برایم خەلیل" و بە پەساپۆرتی تەزویری عێراقییە، کە لە نووسینگە بازرگانییەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ک) یا (حیزبی تورکمان - بەرەی تورکمان)ەوە مۆڵەتی ڤیزەی تەنیا (١٠) ڕۆژی پێ وەردەگیرێت بۆ تورکیا. ئەوی تریان بە نهێنییە و بە ڕێکەوتن لەگەڵ قاچاخچی و چاوساغە کە هەرگیز جێگای متمانەش نین. لە سنوورەکان و بە چیا سەخت و دژوارەکانی کوردستاندا بۆ ئەو دیوی سنووری ئێران ئنجا تورکیا یا ڕاستەوخۆ بۆ تورکیا دەپەڕنەوە. بەڵام دیارە ڕێگای دووەم و تێپەڕین بە سنوورە دژوارەکانی کوردستان-ئێران، کوردستان-تورکیا، ئێران-تورکیادا، پڕە لە خەتەرو مەترسی گرتن، بریندابوون، کوژران بەدەستی جەندرمەکانی تورک یان پاسدارانی ئێرانی.

چیرۆکەکان هەمە جۆرو هەمەڕەنگن، هەر کەسەو کۆمەڵێک بەسەرهاتی خۆی پێیە. **زانا** و **بەهمەن** لە چاوپێکەوتنێکدا، ئاوا بەشێک لە بەسەرهاتی خۆیان باس دەکەن:

**پرسیار: ئایا ئێوە لەبەر هەژاریی و نەبوونیی بیرتان لە هاتنە دەرەوە کردەوە، یان هۆیەکی تر هەبوو؟**
هەردوکیان دەکەونە قسەو وەڵامەکان بۆ یەکتریی تەواو دەکەن:
-نا، لەبەر نالەباریی بارودۆخی کوردستان، ژیان نەماوە، کاروکاسبی نییە، هیچ کەسێک ژیانی تەئمین نییە، پێشمان وایە ئەو هەموو خەڵکەش کە ڕادەکەن، بەهۆی مەسەلەی سیاسییەوەیە کە ئەمڕۆ لەکوردستان دروست بووە.

**پرسیار: پێتان وایە خەڵک بە هۆی چاولێکەرییەوە بێتە دەرەوە؟**
زانا: بەڵێ هەیە بەهۆی چاولێکەرییەوە ڕوو دەکاتە دەرەوە.
-بەهمەن: بەڵام ئەمە ڕێژەیەکی کەمە.
زانا: ڕاست دەکەیت.

**پرسیار: بە چ ڕێگایەک و چۆن دەستان پێ کرد؟**
زانا: لە ڕێگای قاچاخچییەوە، کە هەر لە سلێمانییەوە لەگەڵیا ڕێک کەوتین بەرەو شاخ و کێوەکانی سەر سنوور، بۆناو ئێران، لەوێوە سنووری ئێران و تورکیامان بڕی.

**پرسیار: ئەمە بەلزیی حکومەتی ئێرانەوەیە؟**
زانا: بەڵێ. دیارە ڕێگای قاچاغ هەیە، بە شاخ و کێو کەژو لادێکانی کوردستاندا تێپەڕ دەبێت. ئێمە نزیکەی دوو ڕۆژ بە پێ و ئینجا بە ئوتومبێل تا شاری (ڕەزائییە-ورمێ) ڕۆشتین، لەوێش لە ماڵی قاچاخچی خەڵکی ئێران و بە چاوساغیی ئەوان سنووری ئێران



وێنەی مرۆڤێکی کورد، دەمی شۆفڵێکی بەرکەوتووە بیکات بە جێگای نووستن.

سەرچاوەی وێنە: Kurdistan in the Shadow of History, Susan Meislas

-تورکیامان بڕی.

**پرسیار: گرتن و لێپرسینەوە نییە؟**

زانا: بەڵێ، زمان نەزانین و شڵەژان و هەندێک حاڵەتی دەروونی کاری خۆی هەیە. کاتێک لە بازگەکانی نێوان شارەکان تێپەڕ دەبین ئەوەی زمان نەزانێت و جلوبەرگی جودا یان شازی لەبەردا بێت جێگای گومانەو دەگیرێت. گرتن و لێپرسینەوەی حکومەتی ئێرانیش یەکجار ناخۆشە. دوای ماوەیەک گیرانیش فڕێ دەدرێتە ئەو دیوی سنووری ژێر دەسەڵاتی پارتی یان یەکێتی و ڕەنگە لەوێش گرتن و لێپرسینەوە چاوەڕوانی گیراوەکان بکات.

**پرسیار: ئەدی ئێوە کاک بەهمەن چۆن دەستتان بەم سەفەرە کرد؟**

بەهمەن: بەهۆی سەرەی تورکمانەوە ناوی خۆم لە نووسینگەی حیزبی تورکمان نووسی کە لە زاخۆیە. دەبێت شەو سەعات(٢.٥)یان درەنگتر بگەیتە بەردەرکی ئەم نووسینگەیە بۆ سەرەگرتن تا بگەیتە لای بەرپرسی پەیوەندی دەرەوەی حیزبی تورکمان. بۆ ئەم مەبەستەش پاسپۆرتێکی عێراقی و معامەلاتی ئاسایشی پارتی، واتە لە لایەن دەزگای ئاسایش و پاراستنی پارتییەوە لێکۆڵینەوەت لەگەڵ دا دەکرێت. من پاسپۆرتەکەم بە ٨ هەزار دیناری عێراقی کڕیبوو، دوای مانگێک لە ئاونووسینەکەم سەرەیەکم بە ٦٠٠ دۆلار وەرگرت.

**پرسیار: ئایا بۆ سەرەوەرگرتن چەند مانگی پێ دەچێت؟**

بەهمەن: بەڵێ، پارتی ڕۆژانە ٨ کەس و حیزبی تورکانیش ٨کەس بە ڕێ دەکات. ئەوەی پارتی بە خۆڕاییە و سەرەکەی یەکجار دوورودرێژە، کە هەندێک جار ساڵێک دەبێت چاوەڕێ بکەیت. پارتیش حەز دەکات لە ڕێگای سەرەی تورکمانەوە ڤیزە وەرگرێت. چونکە ئەویش هاوبەشە لەو پارەیەی کە لە خەڵکەکە وەردەگیرێت بۆ ڤیزە، واتە بە ناڕاستەوخۆ ئەمەش هەر سەرەی پارتییە.

**پرسیار: ئایا حکومەتی تورکیا نازانێت ئەم پەساپۆرتانە تەزوورن؟**

بەهمەن: بەڵێ، بەڵام ئەمە ڕێکەوتنێکەو تیجارەتێکە لە نێوان حکومەتی تورکیاو پارتی و حیزبی تورکماندا. ئەوان بە ڕەسمی دان بەو پەساپۆرتانەو بە ڤیزەکەی خۆشیاندا نانێن. زۆرجار دوای یەک دوو ڕۆژ تێپەڕبوون بەسەر ڤیزەکەدا خەڵکەکە لە لایەن پۆلیسە چەتەئاسایییەکانی تورکیاوە دەگیرێن و دەبرێنە بەشی (بێگانە-یابانجی) لە ئەمنیەتی ئەستنبوڵ، ئەنقەرەو دواتر (سنورداش-دیپۆرت) بە کوردی فڕێ دەدرێنەوە بۆ سەرسنوورو تەسلیم بە پارتی دەکرێنەوە.

**پرسیار: ئەدی یانی چی ئەم دە ڕۆژ ڤیزەیە؟**

بەهمەن: ئەمە تەنیا بۆ ئەوە چاکە کە بە بێ ترس و بە سەلامەتیی بگەینە ئەستەنبوڵ و ترسی ڕێگا خەتەری گرتن، کوشتن و برینداربوون بە مین تێپەڕێنین. بۆ ئەوەی بەزوترین کات فریای خۆمان بکەوین بۆ دەربازبوون لە تورکیا و پۆلیسە بێ ویژدانەکان.

**پرسیار: ئێوە کە گەشتنە ئەوێ دەبێت چی بکەن؟**

بەهمەن: بە زووترین کات خۆمان تەسلیم بە قاچاغچی بکەین، ڕێگایەکی ڕاکردن و دەربازبوون پەیدا بکەین. قاچاغچییەکان شوقەی خۆیان هەیە خواردن و خەو و مانەوەمان بۆ دابین دەکەن تا بەڕێ دەکەوین.

**پرسیار: ئەم قاچاخچییانە خەڵکی کوێن؟**

کوردی عێراق، خەڵکی سلێمانی و هەولێرو..

زانا: من دوو کەسم دەناسی تا گەیشتبوونە ئەستەنبوڵ چەند ڕۆژێکیان لە ڕێگا لە دەست دابوو لەوێش گیرابوون، ئیتر یەکسەر بۆ "برایم خەلیل" سنووریداش کرابوونەوە.

لە چاوپێکەوتنێکی تردا لەگەڵ (مەمەق) بەسەرهاتی گەیشتن بە ئەستەمبوڵ و سنورداشکردنی خۆی ئاوا بۆ گێڕاینەوە:

-ساڵی پار دوای ئاونووسین و چاوەڕوانییەکی دوورو درێژ کە نزیکەی ٨ مانگی خایاند لە ڕێگای نووسینگەی جەوازاتی (برایم خەلیل)ی پارتی، بە هەزار واستەو واستەکاریی توانیم بە پەساپۆرتێکی عێراقی تەزویر، کە ئەگەر ئەو کاتە لە بازاری دۆلار بمکڕیایە بە ٢٠ هەزار دیناریش نە دەکڕدرا، لە پردی برایم خەلیل لەگەڵ پۆستەی پارتی چوومە سلۆپی ئەودیو سنوورە دەسکردەکەی نێوان ئەم دوو بەشەی کوردستان و چاوم بە سیما

دوژمناکارانەکەی ئەتاتورک کەوت. دوای چاوڕوانییەکی تاقەت پروکێن لەو خاڵی دەربازبوونەی تورکیا، کە تا ئێوارەیەکی درەنگی خایاند، بەرەو ئەستەنبوڵ کەوتمە ڕێ. ڕۆژێکم هەر لە سلۆپی لە دەست چوو، شەوو ڕۆژێکیش ڕێگای سلۆپی –ئەستەنبوڵ کە ٢٤ سەعاتێکە. ئیتر دوو ڕۆژ لە نێو سەرماوسۆڵەی زۆر سەختی ئەستەنبوڵدا سوڕامەوە. بە دوای قاچاخچیدا، شەوێک، شەوێکی زۆر تاریک و پڕ لە بەدبەختی لە میوانخانەیەک گیرام لەگەڵ کۆمەڵێک مرۆڤی سیاچارەی تری وەک خۆم. من تورکیم دەزانی، زۆرم هەوڵ دا بە چەند وشەیەکی شەق و شێتی تورکی حاڵییان بکەم بێ هودە بوو. دەمگوت من بە ڤیزەی ڕەسمی هاتووم هێشتا پێنج ڕۆژم لە ڤیزەکە ماوە، بەڵام ئەمان گوێیان لێ نەگرتم. بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لە زیندانی ئەمنیەتی ئەستنبوڵ ماینەوە لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی تری وەک خۆم. دوای ئەم دوو ڕۆژە بۆ لای حاکمێکیان بردم. حاکم بڕیاری ئازادکردنی دام بەڵام ئەمنیەت دانیان بە بڕیارەکەدا نەنا. هەربۆ ناو بردمیانە لای حاکم.من هێشتا سێ ڕۆژ ڤیزەم مابوو. بەڵام ئەوان بە زۆرداری و کەللەڕەقیی گەڕاندمیانەوە بۆ زیندان تا تەواوکردنی ٣ ڕۆژەکەی تریش. ئینجا لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی تردا سواری پاسێکیان کردین بۆ برایم خەلیل. دوای ئەوەی بۆ هەر یەکێک ٥٠ دۆلاریان لێ سەندین، تەسلیم بە پارتی و ئاسایشی پارتیان کردینەوە. ئەگەر ناوم لەوێ لای ئاسایش نەبوایە کە تەنیا بۆ ئەمەیان بەختم هەبوو، ئەوا دەبوایە چەند ڕۆژێکیش لای ئەوان زیندانی بکرێم. دوای پرسیارو لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، لە زیندانی ئەستەنبوڵ ژمارەیەکی زۆر زیندانی هەبوون ئەگەر بکرایە باس و بەسەرهاتی ئەم خەڵکە تۆمار بکرێ ئەوا کۆمەڵێک چیرۆکی پڕ لەژان و تراژیدیی پڕ لە ئێش و ئازار و ژان دەست دەکەوت. لەوێ لە هەموو ڕەگەزو میللەتێک زیندانی کرابوون. ژن و پیاو، کوردو عەرەب، فارس، ئەلبانی، ڕوس، یۆنانی،..هتد. بە پاسەپۆرتی تەزویر بە پێناسەی تەزویر. خەڵکی وا هەبوو بۆ گەشت و سەیران بە پەساپۆرتی ئەورووپایی، ئەمەریکیی هاتبوون بۆ ئەستەنبوڵ، بەڵام ئەوان لەم زیندانە میوانیان دەکردن.

**پرسیار: ئێوە بۆ ڕاتان کرد بۆ بڕیاری کۆچتان دا؟**

مەمۆ: دەپرسم بەس نیە ژیان لە سێبەری جەنگدا، تاکەی مۆمی تەمەنم لە بێمانایدا بسوتێت؟ دە ساڵ شەڕی عێراق و ئێران. حەوت ساڵیش شەڕی حکومەتی سەوزو زەرد، باشە پێتان وایە من چەند دەژیم؟

**پرسیار: ڕاستە ڕاکردن و کۆچڕەو ئەمڕۆ لە کوردستان چاولێکەرییە؟**

مەمۆ: ڕەنگە بۆ هەندێک کەس ڕاست بێت، بەڵام ئەگەر باس بێتە سەر هەموو ئەو کەسانەی دۆزەخی ناوچەی ئارام چۆڵ دەکەن، ئەوا تەنیا درۆودەلەسە و پڕوپاگەندەی حکومەتی عەشایەری پارتی و یەکێتییە. باشە دەیان و سەدان مامۆستاو شارەزاو مرۆی شۆڕشگێڕ کە لە دوای ڕاپەڕین و پێکهێنانی پەرلەمان و حکومەتی کوردستان گەڕانەوە بە مەبەستی خزمەتکردن ئەوانیش جارێکی تر هەر بە چاولێکەریی ڕوویان لە دەرەوە کردەوە یان زوڵموزۆر و بێموراڵی حیزبە باڵا دەستەکان ئەوانی ناچار کرد رابکەن و سەری خۆیان هەڵگرن؟

**پرسیار: دەڵێن عیشقی پارەو دۆلار، هێنانەوەی ئۆتۆمۆبیل و دواتر کڕینی خانوو و زەوی، و ژنی جوان ئەم خەڵکەی هەڵفریواندووە، تۆ دەڵێی چی؟**

مەمۆ: دوور نیە ئەم ڕوانگەیە هەندێک کەس بگرێتەوەو ئەمە ڕاست بێت، بەڵام لافاوی بەربڵاوی کۆچکردن ئەم ڕوانگەیە بە درۆ دەخاتەوە. ئەگەر ئێوە لە نزیکەوە ئاگاتان لە دۆزەخی تیرۆر و ڕەشەکوژیی ئەم دوو حیزبە باڵا دەستە بێت، لە نزیکەوە بۆنی بارووتی شەڕو جەنگی هەمیشە درێژخایەنەکانیان بکەن، دەزانن دەیان هۆکار هەن خەڵک دەردەپەڕێنێت. پێم ناڵێی کەی شەڕی نێوان ئەم دوو حیزبە دەبڕێتەوە؟ کەی ئەم دوو سەرکردایەتییە واز لە کەوا سووریی دێنن بۆ ڕژێمی ئەنفالەکانی بەعس، بۆ ڕژێمی فاشستی تورکیا، بۆ ڕژێمی کۆنەپەرستی ئێران؟ پرسیار دەکەم تۆ حەز دەکەیت و پێت خۆشە سەرتاپای شەو و ڕۆژی ژیانت لە نائارامییدا بگوزەرێت؟ حەز دەکەیت ماڵەکەت، گەڕەکەکەت و شارەکەت وەبەر تۆپباران بکەوێ و هەمیشە لە ژێر ڕەحمەتی تۆپبارانی پارتی و یەکێتی، یان ڕژێمی ئەنفالچییەکانی بەعسدا بێت؟

## ڕێکخراوی ئاوارەو ئەنفالەکانی کوردستان

دوای زنجیرەیەک کۆبوونەوەی ژمارەیەک کەسانی خوێنەوارو کەسوکاری ئەنفالکراوەکان، لە ڕۆژی (١٩٩٤/٩/١)دا، لە ناوەندی ڕۆشنبیری سەردەم لە هەولێر، ڕێکخراوی ئاوارەو ئەنفالکراوەکان دادەمەزرێت.

دامەزراندنی ڕێکخراوێکی وا، کاردانەوەی کۆمەلایەتیی خەڵکییە بەرامبەر بە هێرشی لەناوبردنی کورد. ئەم کاردانەوە سروشتییانە تا چ ڕادەیەک بۆ پێشەوە براوەو توانیوویەتی چی بکات، کێشەیەکی سیاسی گرنگە. پارتەکانی کوردستان تا چ ڕادەیەک ئەرکی خۆیان لەم کارەساتانەدا بینیووە؟ ئەمە یەکێکە لەو پێوەرە گرنگانەی کە باشیی و خراپیی ئەوانی پێ دەپێورێت. بەڵام کێ قەرزاربارە بە وەڵام ئەگەر من و تۆ مافی پرسیارکردن بە خۆمان نەدەین!

---

**سکرتێری ئاوارەو ئەنفالەکان چی دەڵێت؟**

**وەڵام: ژمارەی داهاتوو.**

## لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی شەڕی ناوخۆدا

کاتێک چەکدارە کڵاو زەردەکان، لەگەڵ دەبابەکانی بەعس گەیشتنەوە هەولێر، بۆ دەرپەڕاندنی چەکدارە کڵاو سەوزە نەیارەکانیان، هەر بەوەندە نەوەستان بۆمبارانێکی خەستی شار بکەن، ترس و وەحشەت بڵاو بکەنەوەو ڕەوایی بە دزیی، تاڵان، ئەنفال و پێشێلییەکانی مافی مرۆڤ بدەن، بەڵکو ئەو پەرلەمانەی بە پیرۆزو بە پەرلەمانی کوردستانیان ناو دەبرد، بۆ جارێکی تر ئاڵای شەرمەزارانەی بەعسیان بە سەردا شەکاندەوە. بە بۆمبی بەعسییەکان زامداریان کرد. حەوشەو دەوروبەری پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیرانە ئازیزەکەیانیان بۆ دەبابەو عەسکەرە ئەنفالچییەکانی بەعس کردە مۆڵگا. بۆ چەند هەفتەیەک دەمی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژنامە، ڕادیۆ و تەلەفیزۆنی هەموو لایەنەکانیان بەبێ جیاوازیی داخست.
لە هەمووی بە جورئەت تر! هەڵسان هەرچی تابلۆو وێنەو پەیکەری شەهیدانی ڕێگای ڕزگاریی هەبوو، ڕوخاندیان. ئەمە وەفاو عەهدێک بوو بۆ شەهیدان. **پایز**

* نیکۆس کازانزاکی لە ڕۆمانی براکوژی دا ناوی دوو دەستە نەیارەکەی شەڕی ناوخۆ بە کڵاو سوورو کڵاو سەوزەکان دەبات. ئەم هێمایەم بە پەسند زانی.



# ڕیپۆرتاژێکی چاوەڕواننەکراو

گۆران قەرەداغی

ڕۆژی (25)ی ژونی1998، لە ڕێگای تورکیا و باکووری کوردستان و پاشان برایم (خەلیل)ەوە، گەڕامەوە باشووری کوردستان. ماوەی دوو مانگ و (25) ڕۆژ لە وڵات مامەوە. هەرچەندە ئەز تەنیا بە مەبەستی سەردانەوەی باوکە پیر و نەخۆشەکەم و بەسەرکردنەوەی کەسوکارو دامرکاندنەوەی تاسەی دوورەوڵاتیم گەڕابوومەوە، کەچی نەکرا خۆم لە کاریگەریتی تەنگوچەڵەمە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی وڵات و شارەکەم دوور ڕابگرم. یەکێک لەو تەنگوچەڵەمانەی کە ڕۆژانە بەرگوێمدەکەوت، بووبووە هۆی مۆمقۆ و دڵەڕاوکێی خەڵکی و ئەمنیشی تەواو نیگەرانکردبوو، بزربوون و دیارنەمانی منداڵانی تەمەن خوار (18) ساڵ بوو. لەناو خەڵکیدا وا باوبوو، گوایە لەوەتەی پارتی کرێکارانی کوردستان ( پ.ک.ک) بارەگای لە نێو شارەکان و بنکەی سەربازی لە چیاکاندا کردۆتەوە، منداڵان بە کوڕ و کچەوە، بە تاک و بەکۆمەڵ بزردەبن.

لە نیوەشەوێکی مانگی ئاگوستی (1998)دا، لە سەرڕێگای سلێمانی - قەرەداغ، پۆلیسی ئاسایش بۆ پشکنین دەست لە ئۆتۆمۆبیلێک رادەگرێت. ئۆتۆمۆبیلەکە لە بری ئەوەی ڕاوەستێت خێراییەکەی پتر دەکات، پولیسیش دەیداتە بەر دەستڕێژ. پاشان دەردەکەوێت، ئۆتۆمۆبیلەکە هی (پ.ک.ک)یە، جگە لە چەند چەکدارێک، دوو منداڵی تەمەن (12- 16) ساڵی تێدایە، یەکێکیان دەپێکرێ.

هەندێک دۆست و برادەری نزیکم دروستیی ئەو دەنگوباسانەیان بۆ دووپاتدەکردمەوە. چەندین بانگەواز و ناڕەزایینامەشم بە لیستی ناوی منداڵانی بێ سەروشوێنەوە، دەدی، لە کۆتایی ئەم دیدارەدا دەقی یەکێک لەو لیستانە، کە لە لایەن کەسوکاری (47) منداڵی ڕفێندراوەوە راگەیەندراوە، بڵاودەکەینەوە.

ئەو دەنگوباسانە بوونە خولیای سەرم، دەمویست ڕاستی و ناڕاستییانم بۆ ساغبێتەوە.

## لە (وەزیارە) ی قەرەداغەوە بۆ (شەمزینان)

لە شارۆچکەیەکی پارێزگای سلێمانی ناسیاوێکم چاوپێکەوت. ئەو، دوو خوشکەزای کە کچن و تەمەنیان (17 – 18)ساڵە، چوونەتە لای (پ.ک.ک). لە بنکەی مەشقی سەربازی لە (وەزیارە)ی قۆپی قەرەداغ، دەورەی پەروەردەو مەشقیان تەواو کردووە و هەنووکە لە چیاکانی ناوچەی (شەمزینان)ی باکووری کوردستان، لە ریزەکانی ( پ.ک.ک) دا پێشمەرگەن. ئەم ناسیاوەم دەڵێت: " ئێمە پاش بگرە و بێنەیەکی زۆر سۆراخی کچەکانمان کرد و بۆمان روونبووەوە، کە لە بنکەکەی قۆپی قەرەداغن. پاش هەوڵێکی زۆر توانیمان چاومان پێیان بکەوێت. ئەوان بڕیاری خۆیان وەها دابوو، کە لای ( پ.ک.ک) بمیننەوە و لەگەڵماندا نەهاتنەوە.



( یەکێک لە دەربەندەکانی قۆپی قەرەداغ )

لە (9)ی ئاگۆستی (1998)دا، لە گوندێکی سەر بە شارۆچکەیەکی تری پارێزگای سلێمانی، بەڕێکەوت، ناسیاریم لەتەک پیاوێکی 30 ساڵانەدا پەیدا کرد. هێدی هێدی بۆمدەرکەوت، کە ئەم پیاوە دۆستی ( پ.ک.ک)یە و ماوەیەکیش لە بنکەی مەشقی سەربازیی قۆپی قەرەداغ بووە. دەتگوت هەنگوینم لە کلۆرە داردا دۆزیوەتەوە. پاش دەمەتەقێیەکی زۆر و زیاتر بەیەکدی ئاشنابوون، داوای دیدارێکم لەگەڵدا کرد. دوای گفتپێدانی پاراستنی جێگای دانیشتن و ناسنامەکەی، داواکارییەکەمی پەسەندکرد.

## دەقی ڕیپۆرتاژەکە:

- لەسەرەتای چاوبەیەککەوتنماندا وا دەرکەوت، کە خۆت بەدۆستی پەکەکە دەزانیت، ماوەیەکیشت لە بنکەی (وەزیارە)ی ناو قۆپی قەرەداغ بردۆتە سەر. ئایا ئەو دۆستایەتییەت چۆن دروستبوو؟
- **لە بەهاری رابردوودا، بۆ خۆم لە ڕێگای ڕێکخستنی شارەوە، پەیوەندیم بە ( پ.ک.ک)ەوە کرد.**
- ئەی چۆن خۆت گەیاندە بنکە سەربازییەکەی قۆپی قەرەداغ؟ ماوەی چەند لەوێ مایتەوە؟
- **لەسەرەتاوە بۆ ماوەی پتر لە مانگێک، لە ناو شاردا لەگەڵ (8) کەسی دیدا بەشداری چەندین کۆبوونەوەی پەروەردەیی ئایدیۆلۆژیمان کرد. ئەوجا هەموومان پێکەوە لەسەر داوای خۆمان رەوانەی بنکەی پەروەردە و مەشقی سەربازیی کراین، لەوێش (25) ڕۆژ مامەوە.**

## (باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات _ وڵات هەر یەکە وڵات)

- کە گەیشتنە بنکەکە، چۆن پێشوازییان لێکردن؟
- **گروپێک لەو پێشمەرگانەی کە دەورەی پەروەردە و مەشقیان تەواو کردبووو لە ریزێکی سەربازییانەدا راوەستابوون، بە دەنگێکی بەرز کە دەروونی دەهەژاند، بە خوێندنەوەی دروشمی:**

(باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات _ وڵات هەر یەکە وڵات)

**پێشوازییان لێکردین.**

- *خۆرئاوا* لە دروشمەکەدا نەبوو؟ - **نەخێر.**
- ئەی چیدی ؟
- **نانمان خوارد، دوای حەوانەوە پێخەفیان داینێ، نووستین. دووەم ڕۆژ گردیانکردینەوە، دووبارە بەخێرهاتنێکی گەرمیان لێکردین. ئیتر گەلێک زانیاریی پێویست و بەبایەخیان لە سەردەورەکە بۆ باسکردین. هەندێک لایەنی سیاسی، ئایدیۆلۆژی و سەربازیی (پ.ک.ک)یان بۆ ڕوونکردینەوە، دوا جار نەخشەی دەورەکەیان بۆ خوێندینەوە. ئەمانە دەستپێکی دەورەی پەروەردە و مەشقە سەربازییەکەمان بوو، کە 45 ڕۆژ دەخایەنێت.**



بنکەیەکی مەشقی سەربازیی (P.K.K)
لە (Kurdistan In the shadow of History) وەرگیراوە

- راستەدەڵێن گوایە ( پ.ک.ک) منداڵ و مێردمنداڵی تەمەن خوار (18) ساڵ دەڕفێنێ و لە بنکە سەربازییەکانیدا، مێشکیان دەشواتەوە و دەیانخاتە ژێر فشارێکی ئایدیۆلۆژیی و مەشقێکی سەختی سەربازییانەوە. پاشانیش بۆ باکووری کوردستان رەوانەی بەرەکانی جەنگیان دەکەن؟
- **بە هیچ کلۆجێک ئەمە راست نییە، بەڵام لە دەورەکاندا گەلێک مێردمنداڵ و تەنانەت منداڵی (8-9) ساڵانەش بەشداردەبن، وەلێ ئەو منداڵانە نە ڕفێندراون و نە شخراونەتە ژێر ئاوەها فشارێکەوە کە تۆ بیستووتە.**
- هیچ بەڵگەیەکت بۆ ئەمە بە دەستەوە هەیە؟
- **بەڵێ، جاری وا هەبوو منداڵی (13-14) ساڵانە لە دەورەکەدا بۆمان دەدوان و دەرسیان پێ دەوتین. ئەو منداڵانە زۆر زرنگ و وریان، لە تێگەیشتنیانەوە ( پ.ک.ک) یان هەڵبژاردووە.**
- باشە چۆن ئەو منداڵانە، لەوانە 8-9 ساڵانە، ( پ.ک.ک) و بنکە سەربازییەکەی، لەو جەنگەڵستانەی قۆپی قەرەداغدا دەدۆزنەوە؟
- **زۆربەی ئەو منداڵانە بەرهەمی کاری ڕێکخستنن لە ناو شارەکاندا، پاش ڕوونکردنەوەی ڕێبازی (پ.ک.ک) و شۆڕشی کوردستان بۆیان، لە سەر خواستی خۆیان رەوانەدەکرێن.**

## منداڵان دەکەنە مرۆڤی بەکەڵک و وڵاتپارێز و شۆڕشڤان

- منداڵ، بەتایبەتی لە تەمەنی (8 –15 ) ساڵیدا وەک کاغەزێکی سپی و بێگەردن. دەبێت باوک و دایک، یان بە پێی یاسا گەورەیەکی متمانەپێکراویان هەبێت، کە دەست بە باڵیانەوە بگرن و سەرپەرشتی پەروەردەبوونیان بکەن، دەنا هەر مرۆڤێک بە ئارەزووی خۆی دەتوانێت چی بوێت تێیاندا بنووسێت. ئایا چێتر نییە ئەو منداڵانە، هیچ نەبێت تا دەبنە (18) ساڵان، مافی ئەوەیان بدرێتێ کە بخوێنن ودەرفەتی فەراهەمکردنی دواڕۆژێکی ڕووناکیان بڕەخسێنرێت؟
- **بەڵێ چاکترە. بەڵام زۆربەی ئەو منداڵانەی کە (پ.ک.ک) رەوانەی بنکە سەربازییەکانییان دەکات، بە ئارەزووی خۆیانە نەک بە تۆبزیی. ئەو منداڵانەش ئەوانەن کە هەر لە ئێستاوە، پاشەڕۆژیان تاریککراوە و بوونەتە قوربانی کۆمەڵگایەک کە نەک تەنیا منداڵ، بەڵکو گەورەشی تێدا لە بچوکترین مافی مرۆڤایەتی بێ بەشکراوە. ئەو منداڵانە زۆربەیان نەک هەر ناتوانن بخوێنن، بەڵکو دەبێت هەمیشە لە پێناوی بژێوی خۆیان و خێزانەکانیاندا، لە سەر شەقامە منداڵخۆرەکانی شار،**

فرۆشیاری دەستگیربن. ئەمڕۆ بێت، یان سبەینێ هەڵدەخلیسکێن و سەدان خراپەکاری و شێوەی بەرەڵایی چاوەڕوانییان دەکەن. (پ.ک.ک) جگە لەوەی لە مەترسی بەرەڵایی و ناهەمواریی ژیان رزگاریاندەکات، دەشیانکاتە مرۆڤی بەکەڵک و ولاتپارێز و شۆڕشڤان.

- دەڵێن زۆربەی ئەو منداڵانە لەوانەن، کە لەگەڵ دایک یان باوکیاندا ناتەبان، (پ.ک.ک)ش کەڵک لەو ناتەباییە وەردەگرێت و بە ئاسانی فریویاندەدات. تۆ چی دەڵێیت؟
- ئەگەر منداڵێک یان لاوێکی تازەپێگەیشتووی کورد، بە هەر هۆیەکەوە بێت، نەتوانێ بە شێوەیەکی ئاسایی و سروشتیی لەناو کۆمەڵدا دەربەرێ، یان لە خێزانەکەیدا بە ئارامی بژی، چیترە (پ.ک.ک) بیگرێتە خۆی و هەم لە تەنگوچەڵەمەو مەترسی دووریدەخاتەوە و هەم بە شێوەیەکی ولاتپارێزانە، بۆ کوردی پەروەردە دەکات.
- ئەو منداڵانە جگە لە کوڕ کچیشیان تێدان؟
- بەڵێ (پ.ک.ک) جیاوازی نێوان کوڕ و کچ ناکات. شۆڕشی کوردستان، بێ بەشداریکردنی ژنان سەرناکەوێت، وەلێ لە بنکەی سەربازیدا جێگەی نوستن و پەروەردەکردنیان جودایە. پاشانیش خواردنەوە و سێکس و خراپەکاری لە بنکەکاندا قەدەغەن.

## بۆچی منداڵەکان بەدەم خەووە دەگرین؟

- دەڵێن هەندێک لەو منداڵانە بە دەم خەووە دەگرین و هاواری دایک و باوکیان دەکەن؟
- نەک منداڵ، مرۆڤی گەورەش خەوی ناخۆش دەبینێ و بەدەم خەووە وڕێنەدەکات. کەی ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەو منداڵانە بەزۆر گلدرابێتنەوە، یان خراپ رەفتاریان لەگەڵدا کرابێت؟
- ئەگەر کەسوکاری منداڵێک بیانەوێت منداڵەکەیان وەرگرنەوە، چییان وەڵامدەدەنەوە؟
- هەرمنداڵێک، کەسوکاری بۆ وەرگرتنەوەی بێنە بنکە، پێشەکی زۆر رێزیان لێدەگیرێ، قسەیان لەگەڵ دەکرێ و بۆیان روونەدەکرێتەوە کە منداڵەکەیان، نەرفێنراوە و بە خواستی خۆی هاتووە. بەکورتی هەوڵ دەدرێت کەسوکارەکە بەوە قایلبکەن کە منداڵەکەیان لای (پ.ک.ک) بمێنێتەوە. ئەگەر قایلنەبوون، ئەوجا ماوەیەک بۆ قسەکردن لەگەڵ منداڵەکە دادەنێن. بە منداڵەکە رادەگەیەنن کە کەسوکاری هاتوون و دەیانەوێ بیبەنەوە. هەوڵدەدەن منداڵەکە رازیبکەن کە نەچێتەوە و کەسوکارەکەی ئیزن بدات.
- ئەگەر کەسوکار سوور بن لەسەر بردنەوەی منداڵەکە؟
- بیروڕای منداڵەکە بڕیاردەدات.
- ئەگەر منداڵەکە ویستی لەگەڵ کەسوکاریدا بڕواتەوە؟
- جارێکی دیش لەگەڵ منداڵەکە دەدوێن، ئەگەر کەڵکی نەبوو، ئەوا دەربارەی پاراستنی نهێنییەکان و نەخشەکان، هەندێ ئامۆژگاری منداڵ و کەسوکارەکەی دەکەن و منداڵەکەیان دەدەنەوە دەست و بە رێزەوە بەڕێیاندەکەن.
- لە سەرەتاوە وتت دەورەکە (45) رۆژە، بەڵام تۆ تەنیا (25) رۆژ ماویتەتەوە، واتە دەورەکەت تەواو نەکرد! بۆچی؟
- بەشەرمەزارییەوە دەڵێم لەبەر سەختی ئەرکی دەورەکە و ناهەمواری باری ژیان لە ناو بنکەکەدا، هەڵێکم بۆ هەڵکەوت و هەڵاتم.
- کەواتە پەیوەندیت بە (پ.ک.ک)ەوە نەماوە؟
- نەخێر پەیوەندیم ماوە، دوای هەڵاتنەکەم خۆم چووم و هۆکاری بەرگەنەگرتنم و هەڵاتنەکەم بۆ گێڕانەوە. ئەوانیش پوزشەکانمیان پەسەند کرد، ئیدی لەوساوە شێوەیەک لە پەیوەندیم لەگەڵیاندا هێشتۆتەوە.
- خەڵکی تریش لە بنکە سەربازییەکەوە هەڵدێن؟
- نەخێر، کەسێک کردە نەبێت و شارەزای ناوچەکە نەبێت، زۆر سەختە لەو ناوقۆپی و چیایانەوە هەڵبێ.
- ئەگەر کەسێک پەشیمان بێتەوە و بیەوێت وازبهێنێ، رێگای خۆکشانەوەی دەدرێت؟
- بەڵێ، ئەگەر پوزشەکانی بەهێز و جێی موتمانە بن.
- ئایا لە بزووتنەوەی چەکداریی کورددا بەشداریت کردووە؟
- بەڵێ لە هەشتاکاندا پێشمەرگە بووم.
- چ جیاوازیەک لە نێوان (پ.ک.ک) و رێکخراوەکانی تری ئەمڕۆی گۆڕەپانی کوردستاندا دەبینیت؟
- رێکخراوەکانی تری کوردستان، بەوانەی خۆرهەڵاتیشەوە، کوردستانیی تەواو نین، مەبەستم ئەوەیە بۆ سەربەخۆیی و دەوڵەتێکی سەراسەری کوردستان تێناکۆشن. ئەمە جگە لەوەی لە راپەڕینی (1991) بەدواوە، کە لە دەست سەدام رزگاریکردین، ئەوان بێ لە بەرژەوەندی پارتایەتی تەسکی خۆیان و پێکداهەڵپڕژان و وێرانکردنی کوردستان، شتێکیان بۆ کورد لە دەست نەهاتووە. پەکەکە کوردستانییە، دەخوازێت سەراسەری کوردستان ئازاد بکا و دەوڵەتێکی کوردستانی سەربەخۆی تێدا دابمەزرێنێ.
- سوپاس بۆ ئەو کات و زەحمەتەی، کە لەگەڵماندا بۆ ئەم دیدارەت تەرخان کرد.

**باشووری کوردستان**

**(7)ی سێپتەمبەری 1998**

## راگەیاندنێک لە کەس وکاری منالە رفێنراوەکانی شاری سلێمانی یەوە

### بۆ گشت حیزب وڕێکخراوە جەماوەری و پیشەیی یەکان

### ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە کوردستان و جیهان

ئێمە کەس و کاری ئەم مندالانەی کە لە خوارەوە ناویان هاتووە زیاتر لە (2) مانگە ئەم مندالانەمان دیار نەماون. سەرەڕای گەڕانێکی زۆر بە شوێنیان دا ئەنجا بەرێکەوت بۆمان دەرکەوت کە ئەم منالانە لە لای (پەکەکە)ن. هەرچەندە (پەکەکە) سەرەتا ئینکاری لەوە دەکرد کە ئەم مندالانە لە لای ئەوان بن، بەلام بەناچاری ئێستا دانی بەوەدا ناوە کە لە لای ئەوانن. ئەم مندالانەی ئێمە زۆربەیان تەمەنیان لە خوار(18) سالەوەیە و (پەکەکە) بە شێوازی جۆراو جۆر ئەم مندالانە فریو دەدەن هەتا ئەوەندەی دەستیان لێیان گیر دەبێ و دەیان بەنە ناو بارەگاکەی خۆیان لە شاری سلێمانی لە فولکەی (دەستەکە)، ئیتر لەوێوە دەستیان بەسەردا دەگرن و دەیان فرێنن بۆ بارەگا سەربازیەکانیان لە ناوچەکانی قۆپی قەرەداغ...هتد. سەرەڕای ئەوەی ئەم مندالانە لەو مەعەسکەرانەدا وەزعێکی زۆر قورس و خراپ بەسەر دەبەن و دوای تەواوکردنی تەدریبێکی قورسی (45) رۆژەو سڕینەوەی مێشکیان بەرەو شوێنە دوورەکانیان رەوانە دەکەن و بە ئێمەش دەڵێن ئیتر ئەوانە کوڕی ئێوە نین و وەکو کەسێکی دەست بەسەردا گیراو (حیجز) مامەلەیان لەگەڵ دەکەن و رێگا نادەن ئێمە بیان بینین و بێنەوە ناومان تەنانەت هەندێکیشمان شوێن و سوراخی منالەکانمان نازانین.

ئێمە ماوەیەکی زۆرە سەرجەم دەزگا حکومەتی یەکانی شاری سلێمانیمان ئاگادار کردۆتەوە بەلام هیچ کەلکێکی نەبووە و چەندەها جار چوینەتە بەردەم بارەگای (پەکەکە) ئەمەش هیچ کەلکێکی نەبووە. هەربۆیە ئێمە چیتر ناتوانین لەوە زیاتر دەستەوسان دانیشین و دەست لە منالەکانمان هەڵناگرین، بۆ ئەم مەبەستەش داواتان لێ دەکەین هەلوێستی رۆشن و ئاشکرای خۆتان لە دژی ئەم کارە نا ئینسانی یەی (پەکەکە) رابگەیەنن و پشتیوانیمان لێ بکەن بۆ وەرگرتنەوەی منالەکانمان و رزگارکردنیان لە ژێر چنگی (پەکەکە)دا.

کەس و کاری
منالە رفێنراوەکانی شاری سلێمانی
1997/7/19

ناوی مندالەکان و موالیدەکانیان

| ناوی سیانی | موالید | ناوی سیانی | موالید | ناوی سیانی | موالید |
|---|---|---|---|---|---|
| کاردۆ عبدالکریم محمود | 1985 | بێستون نوری رەزا | 1981 | رێزین محمود محمد | 1982 |
| غریب عبدالرحمن نوری | 1985 | هۆگر خلیل سعید | 1982 | ئالان محمد نوری | 1981 |
| سۆران محمد محمود | 1985 | قانع واحد احمد | 1982 | ئاسۆ حسین احمد | 1981 |
| لوقمان عبدالکریم محمود | 1984 | سۆران عمر خورشید | 1982 | کاروان کریم | 1980 |
| هێرش محمد | 1984 | لیلی سلاح الدین | 1982 | نوزاد انور احمد | 1980 |
| گۆران محمود | 1984 | فەرەیدون حسین احمد | 1982 | تارق عزیز عبدالله | 1980 |
| شوان جلیل رشید | 1983 | کەیوان عزیز هیدایەت | 1981 | شاخەوان علی محمود | 1979 |
| ئاری حسین احمد | 1983 | زانا حسین مجید | 1981 | یادگار نازم عبدالله | 1979 |
| بەهرام محمد سعید | 1983 | توانا جبار حمە امین | 1981 | دانا علی | 1979 |
| کاوە یاسین مارف | 1983 | هاوکار عمر حمە امین | 1981 | سوران رفیق محمود | 1979 |
| هەردی فریق علی | 1983 | نەبەز عبدالله رحمن | 1981 | اکبر اسماعیل نورالدین | 1978 |
| دانا مستەفا رشید | 1980 | ئارام جعفر مارف | 1982 | هەلکەوت رووف حسین | 1982 |
| ئاوات عبدالله حسین | 1980 | کەیوان انور کریم | 1982 | پەیام محمد رفیق | 1985 |
| ئاری مستەفا محمود | 1980 | بێستون عوسمان حسین | 1980 | توانا بابا رسول ابراهیم | 1981 |
| محمد ابراهیم رحیم | 1980 | تەها محمد کریم | 1981 | بەختیار ابراهیم احمد | 1981 |
| | | شاباز محمود موستەفا | 1984 | حسین علی حسن | 1981 |

# ئەی پەکەکە چی دەڵێت؟

لە مانگی (8)ی ئەم ساڵیشدا کێشەی (پ.ک.ک) و دیارنەمانی منالە کورد لە سوید، کەوتە بەردەمی حکومەتی سویدی. لە ناو تەلەفیزیون، رۆژنامەو بڵاوکراوەکانیشدا باسی لێوە کرا.

کۆنتراکت بۆ ژمارەی داهاتوو دەربارەی ئەم کێشەیە پرسیارنامەیەک ئاراستەی لێپرسراوانی (پ.ک.ک) دەکات.

( کۆنتــراکت )

# چوار کەس و دوو پرسیار


کاکە وەیس


حەمە سەعید حەسەن


فاتح رەسوڵ


عومەر شێخموس

گۆڤاری کۆنتـراکت بە ئەرکی خۆی دەزانێت کە دەربارەی هەندێک رووداوی گرنگی کوردستان، کە پێویستە لە بواری سیاسیدا لێی بکوڵرێتەوە و گفتوگۆی لەسەر بکرێت، رۆڵی خۆی ببینێت. ئەو رووداوانە بە پلەی یەکەم لە سەر خەڵکی هەژاری کوردستان دەکەوێت و لە سەر حسابی ئێستا و داهاتووی هەموومانە و تەنیا مەسەلەی نێوان هێزە کوردییەکان نین.

ئەوانەی روو دەدەن چین و هەڵوێستەکانمان چی پیشان دەدەن؟ ئەو بارە ناهەموارە سیاسییەی هەیە تا چ رادەیەک دیارە بە نووسەران و ناسراوان و خاوەن بروانامەکانەوە! خەڵک چی بکات کاتێک کە کارەساتێکی سیاسی روو دەدات؟

بۆ ئەو مەبەستە کۆنتراکت ئەم پرسیارنامەیەی خوارەوەی ئاراستەی چەند کەسێک کرد کە بەسوپاسەوە وەڵامی هەندێکیان لەم ژمارەیەدا بڵاو دەکەینەوە، بەهیوای ئەوەی لە ژمارەکانی داهاتوودا وەڵامی ئەوانی تریش بڵاوبکەینەوە.

- رۆژی **1996/8/31**، پارتی دیموکراتی کوردستان(پ.د.ک) بۆ گرتنەوەی هەولێر پێش سوپای عێراقیی کەوت و ئاڵای عێراقیان لە سەر خانووی پەرلەمانی کوردستان هەڵکرد. دیسان لە رۆژی **(1997/5/14)** یشدا، سوپای تورکیا بە پاڵپشتی (پ.د.ک) تا هەولێر هات.
- لە ناوچەی ژێر دەستەڵاتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ( ی.ن.ک)یشدا هێزی ئێران بۆ کوشتنی کوردی رۆژهەلات تا کۆیە هات. تا ئێستاش ژمارەیەکی زۆر بە دەستی رژێمی ئێران لەم ناوچەیەدا تیرۆر کراون.

**پرسیار :**

**ئایا ئەم رووداوانە بەلای ئێوەوە چین (خیانەت، هەڵە، نیشتیمانپەروەریی، ....)؟ قسەتان بۆ وەڵامەکەتان چییە؟**

## گەورەترین خیانەتی نەتەوەیی و نیشتیمانیی لە مێژووی نەتەوەی کورد دا



**عومەر شێخموس:** پێشکەوتنی هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ک)و هاتنی سوپای عێراق لە (1996/8/31)دا بۆ داگیرکردنی پایتەختی حکومەتی هەرێمی کوردستان '' هەولێر'' و بەرزکردنەوەی ئاڵای رژێمی سەدام حوسەین لە سەر خانووی پەرلەمانی کوردستان، لە دوابیدا هاوکاریکردنیان و هێنانی لەشکری تورکیا بۆ باشووری کوردستان لە مانگی (3)ی 1995، (1997/5/14)، مانگی (10)ی 1997 و مانگی (5) ی 1998 دا. هەروەها هەروەک رابوردووش کە هێزەکانی ( پ.د.ک) لە سالانی 1979 تا 1985 هاریکارییان لەگەڵ هێزی پاسدار و لەشکری ئێراندا لە کوردستانی رۆژهەلاتدا کرد دژی میللەتی خۆیان.

ئەم کارانە بە لای منەوە گەورەترین خیانەتی نەتەوەیی و نیشتیمانین لە مێژووی گەلی کورددا. بۆچی؟ لەبەرئەوەی سەرکردایەتی پارتی و بارزانی، بۆ بەزۆرسەپاندنی هێزو دەستەلاتی خۆیان، هاوار بۆ هێزەکانی دوژمنانی گەلی کورد و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان دەبەن. لەبەر ئەوەش سەرکردایەتی پارتی و بارزانی بەئارەزوو و رەزامەندی تەواوی خۆیان ئەم هێزە داگیرکەرو دوژمنانە بۆ هاوکاریکردن و شەرکردن دژ بە میللەتەکەی خۆیان بانگ دەکەن، تا لەو رێگایەوە ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیان، کە دژ بە بەرژەوەندی گشتیی نەتەوەی کوردە، بەدەست بهێنن. ئەنجامی هەرە خراپی ئەم خیانەتانەی پارتی و سەرکردایەتی بارزانی لە هەموو

پارچەکانی کوردستان دا، لاوازکردن و تێکدان و لەناوبردنی شۆڕشەکانی گەلی کورد بووە.

بەڕای من زاڵبوونی سەرکردایەتی بارزانی بەسەر پارتی و بزووتنەوەی گەلی کورددا، لە ساڵی (1964)ەوە تا ئەمڕۆ، بەگشتیی بۆتە گەورەترین تەگەرەو ڕێگر لەبەردەم گەیشتنی گەلی کورد بە ئامانجی دێرینی خۆی، ئەویش کە ڕزگار بوون و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیەتی.

## یەکێتی نە ئەم هێزەی بانگ کردووە و نە هاواری بۆ بردووە و نە دژی میللەتی خۆیان و دژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش، هاوکاری لەگەڵ نەکردوون

ڕەوشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هێرشی هێزەکانی ئێرانی بۆ سەر بارەگاکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان (ح.د.ک) لە کۆیەو لە دواییدا تیرۆرکردنی هێندێ لە لێپرسراوان و کادێر و ئەندامانی چەند هێزێکی ئۆپۆزیسۆنی کوردستانی ڕۆژهەلات لە ناوچەکانی ژێر دەستەلاتی (ی.ن.ک) زۆر جیاوازییان لەگەڵ ڕەوشت و کردەوەکانی (پ.د.ک)و سەرکردایەتی بارزانیدا هەیە.

یەکەم لەبەر ئەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان نە ئەم هێزەی بانگ کردووە، نە هاواری بۆ بردووە و نە دژی میللەتی خۆشیان و دژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران **(ح.د.ک)** هاوکاریشی لەگەڵدا کردوون. بە پێچەوانەوە **(ی.ن.ک)** پێشترسەرکردایەتی **(ح.د.ک)**ی ئاگادارکردەوە کە ئێران نیازێکی وای هەیە، وەکو جارانیش ناتوانێت بەرەنگاری هێزەکانی ئێران بکەن، بۆیە دەبێت خۆیان بپارێزن و شتە گرنگەکانی خۆیان دەرباز بکەن. هەر واشیان کرد. بۆیە یەک نەفەریشییان لێ نەکوژرا، بەڵکو کەسیشیان لێ بریندار نەبووە.

دووەم لەبەر شەڕی ناوخۆ، **(ی.ن.ک)** لاواز بووە. بۆیەش ناتوانێت وەکو جاران بەرەنگاری هێزەکانی ئێران ببێتەوە.

خاڵێکی گرنگی تریش ئەوەیە کە (ی.ن.ک) بە پێچەوانەی (پ.د.ک)ەوە، هەردەم یارمەتیدەر، هاوکارو پشتیوانی هێزە نیشتمانپەروەر و ڕزگاریخوازەکانی هەموو بەشەکانی تری کوردستان بووە.

دەربارەی تیرۆرکردنی خەڵکی ئۆپۆزیسۆنی کوردستانی ڕۆژهەلات لە ناوچەکانی ژێر دەستەلاتی (ی.ن.ک)دا، بەڕای من گەورەترین و بەدەستەلاتترین دەوڵەتی جیهانیش ناتوانێت ڕێگا لە کاری تیرۆریستی بگرێت. یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە پێی توانای خۆی هێندێک لەو تیرۆریستانەی گرتووەو دادگایی کردوون و هێندێکیشی لێ ئیعدام کردوون.

ئەگەر ڕەخنەیەک یان گلەییەک هەبێت، ئەویش لەوەدایە کە بۆچی **(ی.ن.ک)** کاری خۆی باشتر ڕێک ناخات تا بە شێوەیەکی وریاتر و چالاکانەتر ڕێگا لەو جۆرە کارانە بگرێت؟ یان بۆچی ڕێگا لە نۆکەرانی ئێران و دەستگاکانی ناگرێت لە کاتێکدا لە هەوڵی خۆدامەزراندندان لە باشووری کوردستاندا ؟ لێرەدا چەند پرسیارێک دێتە کایەوە:

**- بۆچی هێزە ئۆپۆزیسیونەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات خۆیان باشتر ناپارێزن و ئۆباڵی پاراستنی ئەمنییەتی خۆیان دەخەنە ئەستۆی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە؟**

**- ئایا خۆیان هیچ بەرپرسیار نین لەوەدا، بە تایبەتی کە سرووشتی تیرۆریستی دەوڵەتی ئایینی ئێران باش دەزانن و تاقیکردنەوەی زۆر تاڵیشیان لە گەڵدا هەیە؟**



**فاتح ڕەسوڵ:** لێرەدا ماوە کەمە بە دووردرێژیی لەسەر ئەم باسە بڕۆین، یان دەیەها نموونە بهێنینەوە کە نەک هەر لە کوردستان بەڵکو لە گەلێک ولاتانی تری ئەم جیهانەدا زۆر کردەوەو ڕووداوی ناڕەوای دژ بە بەرژەوەندی نیشتمانیی و نەتەوە کراون. هێندێک جاریش لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتیی پارتێک یان بنەماڵەیەک یان ناوچەیەک سازشکاری بە نیشتمان و نیشتمانپەروەریی کراوە، کەچی لە ئەنجامیشدا ئەوانەی ئەو هەموو پاشەڵپیسییەیان بە دواوە مابۆوە تا ماوەیەکی زۆریش لە گۆڕەپانی ڕزگاریخوازی نیشتیمانیی یان کاروباری ولاتەکەیاندا ڕۆڵی خۆیان هەر بینیووە.

## بە ڕاو بۆچوون و کێشوپێوانی من، بە هەڵوێستی خیانەتکارانەی دەزانم و لە قەڵەمی دەدەم

### خیانەت و هەڵوێستی خیانەتکاری!

ئەو ڕووداوو کارەساتانەی لە پرسیارەکەدا ئاماژەتان بۆ کردوە، بەڕاشکاوی دەڵێم: بەڕاو بۆچوون و کێشوپێوانی من، بە هەڵوێستی خیانەتکارانە **(المواقف الخيانية)**ی دەزانم و لە قەڵەمی دەدەم. لێرەدا پرسیارێک دێتە بەردەممان کە ئایا جیاوازی لە نێوان خیانەت و هەڵوێستی خیانەتکاریدا چییە؟ لە تێڕوانین و بەراوردکردنی مندا، هێڵێکی یەکجار تەسک،

دۆڵێکی پڕ لە مەترسی، هەڵدێرێکی کوشندە لە نێوان "خیانەت" و "هەڵوێستی خیانەتکاری"دا دەبینم.

**خیانەت** ئەوەیە کە پارتێک، گروپێک یان تاکە کەسێک بە تەواوی لە سەر ئەو ڕێباز و پرۆگرام و ئامانجانە لابدات، کە ساڵەهای ساڵ بە خواست و ئارەزووی تەواو هەڵی بژاردووە و تەقەلای زۆری لە پێناو سەرکەوتنی داوە. کەچی لە قۆناغێکی دیاریکراودا هێڵێکی ڕاستوچەپ بەسەر ڕابووردو و خەبات و قوربانییەکاندا دەهێنێت و سوور ئەبێت لەسەر خزمەتکردنی دوژمنانی بیر و ئامانج و پرۆگرامەکانی پێشووی خۆی. لەوەش زیاتر بەتەواوی چۆک بۆ دوژمنەکان دائەدات و ئەبێتە بەکرێگیراویان. خیانەتکار بە هیچ شێوەیەک ماوەی پەشیمانیی و گەڕانەوە و وازهێنان لە تاوانەکان ناهێڵێتەوە. لە خانەی نیشتمانیی و مرۆڤایەتی دوور دەکەوێتەوە و بەتەواوی دەکەوێتە بەرەی دوژمنی گەلەکەیەوە.

بەلام **هەڵوێستی خیانەتکاری** ئەوە دەگەیەنێ کە هێزێکی سیاسی یان پارتێک یان تەنانەت تاکە کەسێکیش کە لە کۆڕی خەبات و تێکۆشانیدا جۆرەها کۆسپ و تەگەرەی لە بابەتی فشاری تیرۆرستی، ئەشکەنجە و ئازاری دێتە ڕێ، بەرژەوەندی تایبەت و داهاتی ژیانی دەکەوێتە گەورەترین مەترسییەوە تا دەگاتە بەر دووڕیانێکی سەخت و خۆی ڕاناگرێت و دووچاری تەنگەتاوی و پەلەقاژەی خۆدەربازکردن دەبێت. ئەو کاتە پەنا دەباتە بەر جۆرەها پنچک و داموودەزگا. ڕێبازی نالەبار دەگرێتە بەر، تا دەگاتە سنوورێک. لەئەنجامی کۆمەڵێک هۆکاردا خۆی ڕادەگرێ و دەوەستێ، دەکەوێتەوە پێداچوونەوە بە گشت کردەوە چەوت و نالەبار و پڕ هەڵەکانیدا.

## هەردوو پارتەکە هێشتا ڕۆڵیان لە کاروانی خەباتی نیشتمانیی کوردستاندا ماوە!

هەرچەندە لەم چوار ساڵەی دواییدا یەکێتی نیشتمانی کوردستان(ی.ن.ک) و پارتی دیموکراتی کوردستان(پ.د.ک) زیانی یەکجار زۆریان بە بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەکەمان گەیاندوە، بەوەی کە هەل و دەرفەتی زێڕینی زۆریان لەکیس کورد دا، خوێنی هەزاران کوردیان بەفیڕۆ چوو، دەربەدەریی و ئاوارەبوونیان دووچاری جەماوەری کورد کرد، خاکی کوردستانی باشوور کرا بە گۆڕەپانێکی کراوە بۆ داگیرکەران و دوژمنانی دێرینی کورد، بەلام بەڕاشکاوی، بێ پێچوپەنا دەڵێم هەردوو پارتەکە، (ی.ن.ک) و (پ.د.ک)، هێشتا ڕۆڵیان لە کاروانی خەباتی نیشتمانیی کوردستاندا ماوە. دەروازە لەسەرپشت و کراوەیە بۆیان. هەردولایان گەر بەجەرگانە چاو بەکردەوەکانیاندا بخشێننەوە و بگەڕێنەوە سەر مێزی گفتوگۆی ئاشتییانە، باری کوردستانی باشوور دەگۆڕێت و ئەو تروسکە هیوایەی ماوە گەشە دەکاتەوە.



**حەمە سەعید حەسەن:** (حیزبی شیوعی عێراق لە بری ئەوەی دۆستی بارزانی بێ کە پیاوی ئێرانی سەر بە سەنتۆیە، دەبوو وەک ئێمە دۆستی حیزبی بەعس بێ کە سۆشیالیستە و ئیعترافیشی بە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات کردووە.) ئەمە یەکێ بوو لەو ڕەخنانەی لە کۆتایی ساڵانی شەستدا نەوشیروان مستەفا لە گۆڤاری ڕزگاری دا ئاڕاستەی حیزبی شیوعی عێراقی (ح.ش.ع) کردبوو. کەواتە ناپاکیش (خیانەت) شتێکی ڕێژەییە، دەشێ ئەوەی من بە ناپاکیی تێ دەگەم کەسێکی دیکە بە نیشتمانپەروەریی لە قەڵەم بدات.

## ناپاکیی مەزنی نەتەوایەتی لە (31)ی ئابی (1996)ەوە دەست پێ ناکات!

چونکە پارتی دیموکراتی کوردستان (پ.د.ک)و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (ی.ن.ک) دوو باڵی یەک بزوتنەوەی نەتەوایەتین، (زۆرن ئەوانەی ئەو دوو لایەنە بە نەتەوەیی نازانن، بەلام من یەکێک نیم لەوانە) ناپاکی لەم حاڵەتەدا، هاوکاریکردنە لەگەڵ داگیرکەردا. دوژمنی داگیرکەر هەر ڕژێمی عێراق نیيە، ڕژێمەکانی سوریا، تورکیا و ئێرانیشن.

ناپاکیی مەزنی نەتەوایەتی لە باشووری کوردستان لە (31)ی ئابی (1996)ەوە دەست پێ ناکات؛ بەڵکو لە ناوەڕاستی ساڵانی شەستەوە بووە بە بەشێکی گرنگ لە کلتووری بزووتنەوەی نەتەوایەتی. من لە نیوەی دووەمی ساڵانی شەستدا بە چاوی خۆم سەرانی (یەکێتی)م دیوە، بە سواری تانکی ڕژێمی عێراق بەرەو کاولکردنی گوندەکانی شارباژێڕ بەڕێ کەوتوون. نامەی وەزیری جەنگی عێراقیم دیوە کە لە ناخی دڵییەوە سوپاسی گەرمی ئەو باڵەی بزووتنەوەی کوردایەتی دەکات کە هاوسەنگەری عێراق بوون و زەبری کوشندەیان لە باڵی بارزانی وەشاندبوو.

ئەوەی لە (31)ی ئابی(1996)دا ڕوویدا هەر درێژەپێدانی ئەو ستراتیژە دێرینە بوو، شتێکی نوێ نەبوو. مەگەر تەنیا لای جەلال تاڵەبانی کوتوپڕیی بوو بێ. ئاخر ئەو هەرگیز لەو جۆرە لووتانەی نەبووە کە بۆنی مەترسی پێش ڕوودانی پێ دەکەن. نەوشیروان مستەفا لە دوا ڕۆژی دوا مانگی ساڵی (1996)دا دەنووسێت: (بزووتنەوە بەکرێ گیراوەکەی مەلا مستەفا تا دێت لە چارەنووسی ڕەش و

تاریکی نزیک دەبێتەوە.){1}. کەچی سێ مانگ بەسەر ئەو "پێشبینی"یەدا رانەبوورد، بارزانی ئەوانی کرد بە پەندی زەمانە. وەک چۆن کەشناس (میترۆلۆگ) دەزانێ سبەینێ باران یان بەفر دەبارێ، هەتاو دەبێ یان هەور، دەبێ سەرکردەیەکیش پێشبینی رووداوەکان بکات، نەک پرخەی گوێی گای دراوسێش هەراسان بکا. مێژوو لە بیری نەچۆتەوە کە لە سەردەمی بارزانیی باوکیشدا، سەرانی بزووتنەوەی کوردی دیوی ئێران لە کوردستانی دیوی عێراقدا تیرۆر دەکران و تەرمیان دەدرایە دەست رژێمی شا، تا بە شاراندا بیانگێڕێ و لووتی خەڵکی کوردیان پێ بشکێنێ. ئێستائەم رۆڵە (پ.د.ک) نایگێڕێ، چونکە (ی.ن.ک) و (پ.ک.ک) لەم بوارەدا پشتی ئەویان لە زەوی داوە.

هەر لێرەدا پێم باشە ئەوەش بڵێمەوە کە کاتی خۆی بۆیە لە حیزبی شیوعی عێراقی (ح.ش.ع) کشامەوە، چونکە ئەو هاوپەیمانی رژێمی داگیرکەری بەغدا بوو. ئەوسا و ئێستاش پێم وایە حیزبی کرێکاران نەک هەر دەبێ لە کێشەی نێوان گەلانی سەردەست و بندەستدا، لایەنی گەلانی بندەست بگرێ، بەڵکو دەبێ هەوڵ بدا جڵەوی ئەسپی بزووتنەوەی رزگاری نیشتیمانی بە دەستەوە بێ. بەلام زۆرن ئەوانەی کاتی (ح.ش.ع) هاوپەیمان یان راستتر کلکی بەعس بوون، بە دڵ و بە گیان لە گەڵی بوون. کەچی کە لەو هەڵوێستەی، کە ناپاکیی چینایەتی بوو، پاشگەز بووەوە و بانگی مافی بڕیاردانی چارەنووسی بۆ گەلی کوردستان دا، لێی کشانەوە. ئەو عێراقچییە توندڕەوانەی جاران، ئێستا کوردستانچی توندڕەون. توندڕەوان راست بن یان چەپ، پۆشاکی کۆمۆنیستانە بپۆشن یان هی نەتەوەییانە، هەر ئاو بە هەمان ئاشدا دەکەن، ئاشی داگیرکەرانی کوردستان.

گەرچی لەسەر وەختی روودانی ناپاکییەکاندا، چ (30)ی تەمووزی 1996 کە چەکدارانی (ی.ن.ک) لە باشماخەوە تا کۆیە پێش پاسداران کەوتن، چ ئەو کاتانەیشی (پ.د.ک) پێش لەشکری عێراق و دواتر هی تورکیایش کەوت و سەبارەت بەو قەسابخانەیەش یەکێتی بۆ کوردی رۆژهەڵاتی سازکردووە، بە ساتیر و بە شێوەی دیکەیش هەڵوێستم نواندووە. بەلام لە مێژە پێم وایە کاتی رەخنەگرتن لەو دوو لایەنە (بەش بە حاڵی خۆم) بەسەر چووە، چونکە لەراستیدا بە درێژایی ژیانم رۆژێک ئومێدم بەو دوو لایەنە نەبووە تا لەم دواییەدا لێیان نائومێد بوو بێتم.

**(پ.د.ک)** لای من هەرگیز شەراب نەبووە، تا لە (31)ی ئابدا بووبێ بە سرکە. لای من ئەویش وەک یەکێتی هەر لە سەرەتاوە سرکە بووە{2}. من خەو بە باشوورێکی بێ **(بەعسی، ئیسلامی، یەکێتی، پارتی، پ.ک.ک)**ەوە دەبینم.

وەک چۆن (31)ی ئابی 1996 سەرەتای پێش لەشکری عێراق کەوتن نەبوو، هەروایش (14)ی ئایاری 1997 سەرەتای پێش سوپای تورکیا کەوتن نەبوو، چونکە لە پاییزی (1992)یشدا (پ.د.ک) و (ی.ن.ک) بۆ لێدانی (پ.ک.ک) پێش جەندرمەی تورک کەوتن. لە (پاشای عەرشی کەلاوە)دا کاتی خۆی باسی ئەو ناپاکییەشم کرد، ئەگەرچی ئەو سەردەمە رەخنەگرتن لە حوکومەتە ساواکەی هەرێم لە خانەی کوفردا بوو.

## ناپاکی لەم حاڵەتەدا هاریکاریکردنە لەگەڵ داگیرکەر

کە یەکێتی تا ئێستا بەتەنیا پێش سوپای تورک نەکەوتووە، لە کوردستانی بوونیەوە نییە، بەڵکو باری جوگرافیا یارمەتی نادات. ئەگەرنا لە پارتی خراپتری بە (پ.ک.ک) دەکرد و بە هەرزانتریش. نامەی جەلال تاڵەبانیم بە خەتی خۆی دیوە کە داوا لە تورکیا دەکات متمانەی پێ بکەن و بۆ قەلاچۆکردنی (پ.ک.ک) سوود لە توانای وەربگرن. (پ.ک.ک)ش وەنەبێت هێندە خاوێن بێت، بەڵکو لە بواری دەست تێکەڵکردن لەگەڵ داگیرکەراندا (سوریا، ئێران، عێراق)، بە گوێزێک پێشی پارتی و یەکێتییە قەزوانخۆرەکانی دایەوە. بزووتنەوەی چەکداریی لە کوردستاندا، بە چاوپۆشین لە سەرچاوەکەی، یان دەڕژێتە سەر گۆمی ناپاکیی(خیانەت)، یان وشک دەکا، یان هەردووکیان.

**(هەر نووسینێ دژی دەسەلات نەبێ، بێ مانایە، تێ ناگەم چۆن هەندێ کەس خۆیان بە نووسەر و شاعیر دەزانن و بە بالای دەسەلاتدارانیشدا هەڵدەڵێن){3}. ئەوەی ستایشی جەللادان بکاو لایەنی ناپاکان بگرێ، ئەوە جنێو بە قوربانییەکان دەدا. ئەو کەسە با بە خەیاڵی خۆشی لای وابێ سواری ئەسپی نوێترین شەپۆلی ئەدەبی بووە، بەلام هەر کۆنەپارێزە.**



**کاکە وەیس:** (31) ی ئاب، ئەوەی لێ دەرچێ کە وەک سی رۆژەکەی تری ئاب، بەقسەی عارەبان، هەر بەگەرماکەی بزماری دەرگا دەتوێنێتەوە، چ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ رۆژانی تری ساڵ و سەدەی خویناوی کورددا نییە. پەشێو گوتەنیش: چۆن بە مۆرفینی هەڵەبجەیەک، هەڵەبجەیەکی تر لەبیر خۆمان دەبەینەوە، ئاواش پلانی ئەوە لەگۆڕێدایە کە بە ئابێک دەیان و سەدان ئابی تر لەبیر خۆمان بەرینەوە، بۆ ئابەکانی داهاتووش چاوڕاو لە یەک بکەین. جگە لەوەش (31) ی ئاب و هێنانی سوپای تورک چاکترین دەستکەوتن بۆ یەکێتی تا بیانکاتە

حەتحەتۆکەو خۆی پێیان جوان بکات، وەک کە جاسوسێتی دامودەزگای زانیاریی بۆ ئێران و بەداوەوەکردنی کوردی رۆژهەلات لە لایەن یەکێتییەوە، کە ئەمە بۆ پارتی لە دەستکەوتە چاکەکانن و کەرەسەی ماکیاجن.

### ئەوەی یەکێتی جوان دەکات، ناشرینیی پارتییە نەک جوانی خۆی.

### ئەوەی پارتیش جوان دەکات، ناشرینیی یەکێتییە نەک جوانیی خۆیان.

سەیرە لە جیهانی ململانێی حیزبایەتیدا، ئەو حیزبە دەیباتەوە کە بەڵێنی چاک دەداو کاری چاک بەئەنجام دەگەیەنێت. کەچی لە کاولەسارەکەی ئێمەدا، یەکێتی چەند پۆخڵەواتی زۆر بێت، بێ خۆماندووکردن ئەوەندە پارتی نازدارتر دەبێت. چەند پارتی قۆڕییاتی زۆرتر بێت، یەکێتی بێ عارەقرشتن، ئەوەندە نەشمیلانە دەبێت. ئەوەی یەکێتی جوان دەکات، ناشرینیی پارتییە نەک جوانی خۆی. ئەوەی پارتیش جوان دەکات، ناشرینیی یەکێتییە نەک جوانیی خۆیان، ئەگینا هەردووکیان لە چاو کێ و لە چاو چییەوە جوانن؟.

گلەیی چیش لە پارتی بکەم کە بەعسی بردۆتە هەولێرەوە لە کاتێکدا تا بەر لووتی کراوەتە عارەبستان و نە خۆی ورتەی لێوە دێ نە یەکێتی خۆی پێ جوان دەکات و نە من گلەیی لێ دەکەم! ئەگەر گلەیی عێراقیی بوونی لێ نەکەم، دیارە مافی ئەوەشم داوەتێ بەعس بێنێ و ئاڵای عێراقی بۆ هەڵ بکات.

### ئەوەی کە بۆیان جێی باس و سەرنێشەنییە ، بەرژەوەندی و رای جەماوەر و چارەنووسی کوردە

ئەگەر یەکێتی هەر لە قینی پارتیش، دەبوو ببوایەتە حیزبێکی کوردستانیی، تا نەفرەتی زۆرتر بەر پارتی بکەوتایە کە هێندە عێراقییەکی تۆخە. بەلام موزایەدەی سیاسیی کە لە جیهاندا دەنگی هەیە، لای ئەو دوو حیزبە بۆتە **(موناقەسە)**: ئەم کەرکوک ببەخشێ، ئەو قەراج، ئەم فیدراڵی بوێ، ئەو ئۆتۆنۆمی. وا دەڕوا تا ئەگەر ئەم **(هیچ)**ی بوێ ئەو لەبەربەرەکانێدا **(هیچتر)** داوا دەکات، تا دەگاتە ئەوەی کێ لێپرسراوی **(شیمال)** بێت، ئەم بڵێ عەلی حەسەن، ئەو بڵێ نەخێر عودەی. ئەوەی کە بۆیان جێی باس و سەرنێشەش نەبێ، بەرژەوەندی و رای جەماوەر و چارەنووسی کوردە.

ئەو رۆژەی کە بەسەر تەرمی شەهیدە ئەنفالکراوەکان و بە کیمیاوی خنکێندراوەکان و بەرزانییە سەرەونگومکراوەکاندا بازیان دا و چوونە بەغدا و بەرهەمی خوێن و راپەرینە مەزنەکەی کوردیان دا بە یەک دوو ماچ، ئیدی دەهۆڵ درا و دەنگی برا. هەرچی بەدوای ئەوەشدا هات و دێت **(تەحسیل و حاسل)**ە، ئەوەشی کە ماوەتەوە هێندێک پرسیارە و چارەسەر لە وەلام و چارەسەریاندایە.

روناکبیرانیش (ئەگەر هەن) بۆ وەک ئەمیبیایان لێهاتووە چاوەچاویانە کە تا بزانن کێ لە کوێ بەرهەمی بلاودەبێتەوە تا لێی وەهەڵلا کەون؟ ئەو مارکسییانەی لە ناهەقیدا تەباو یەکگرتوو بوون، بۆچی وا بۆ هەقخوازیی پەرتن؟ بۆچی کە بەربەرەکانێتی بیری کوردستانیان دەکرد یەکگرتوو بوون، بەلام کە بوون بە کوردستانیی ئیتر یەک و یەکیان نەبوونە دوو؟ ئەدی ئەو نەتەوەییانەی (بە منیشەوە) ولاتیان بۆ کورد دەویست، بۆ هەر یەکە بوونە ولاتێک و کەوتنە ولاتێکی ترەوە؟ ئەدی ئەمانە هەموویان کە لەگەڵ سیاسەتی پارتی و یەکێتیدا تاقوفیق و ناتەبان، لە چیدان؟

بۆ ئەوەی لە ناو گۆلمەزەکەشدا نەبین و دەنگیشمان ببیسترێت، ماوەتەوە ئەوەی بە هەوای ئابی گرتن و ئابی بەردان، گێژبین و پاڵی لێ بدەینەوە و بڵێین: ئای گورگە بۆر! ئەگەر مەلا نەدەمرد، تۆش کەرە بۆزت نەدەخوارد.

**پرسیار:**

### خەڵک لەم کاتانەدا چی بکات باشە؟



**فاتح رەسوڵ:** لە دوا بەدوای هەلگیرساندنی گێنچەڵ و یەکترکوژییەکەی 1994/5/1، ئەوە چوار ساڵە، باری کوردستانی باشوور، لە هەموو روویەکەوە گەلێک گۆڕانی بەسەر هاتووە. چوار ساڵە شەڕی کوردکوژیی، دەربەدەرکردن و وێرانکردن، ناوچەگەریی و خێلەگەری، سۆرانی و بادینانی، بەفراوانی و ناڕەوا بلاو بۆتەوە و گشت کوردستانی باشووری گرتۆتەوە. بەدرێژایی ئەم چوار ساڵە، بەشی هەرە زۆری دانیشتوانی هەرێمەکە و کوردی دەرەوەی ولات، ئافرەتان، دایکانی شەهیدان، ئەندامانی پەرلەمان' رۆشنبیران، خوێندەوار و زانایان، دڵسۆزانی نەتەوەکە، دیموکراتخوازان، ئاشتیخوازان و پیاوانی ئایینی و کوردی دەرەوەی ولات، بە هەزاران نامە و سکالا و بانگەوازیان کردووە بۆ راگرتنی شەڕەکە و داوایان لە سەرکردایەتی (ی.ن.ک) و (پ.د.ک) کردووە کە ئاشتی بگەڕێننەوە بۆ کوردستان و داشی دامەی دەستی دوژمن نەبن. بە هاریکاریکردنی سەرتاپای پارت و هێزە کوردستانییەکان، رەگوڕیشەی شەڕی براکوژی هەلبکێشن و چیتر رۆڵەی کورد خوێنی بەفیڕۆ نەچێت و سوکایەتیکردن بە یەکتر و بە کورد بەس بێت، با چیتر دڵی دوژمنانی داگیرکەر شاد نەکەین.

## چارەسەرکردن ئاشتبوونەوە و یەکێتی ریزەکانە

ئەزموون و تاقیکردنەوە تاڵ و تفتەکانی ئەم چوار ساڵە دەری خست، کە بە شەڕی ناوخۆ و گوێڕایەڵیی بۆ داگیرکەران هیچ لایەک بە هیچ ناگات. تاکە رێگا بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان و رزگارکردنی نەتەوەکەمان لەم کارەساتە، ئاشتبوونەوە و یەکێتیی ریزەکانە. لە باری ئێستای هەرێمەکەدا هیوایەکی بەسوود لە کەلی ئاسۆدا بەدی دەکرێت. لە ئەستۆی رۆشنبیران و نووسەران و هونەرمەنداندایە، کە بەوتاری چاک و قسەی جوانی رێکوپێک و پڕمانا، قەڵەمەکانیان زیاتر بخەنە کار، تەقەلاکانیان فراوانتر بکەن، دەنگ و بێزاریی بەرز بکەنەوە دژی ئەوانەی بەنزین بە ئاگری کوردکوژیدا دەکەن تا ریسوا بکرێن و نەفرەتیان لێبکرێت. هەروەها خەڵکی کوردستان و سەرتاپای پارت و هێزە سیاسی و کۆمەلایەتییەکانی کوردستان بگەنە سەر ئەو بڕوا و رایەی کە کاتی ئەوە نەهاتووە، تا بۆ ئەو چەوتو هەڵوێستە نالەبار و پڕ هەلەکانیانی سەرکردەکان، پاکتاوکردن (تصفيـــة الحســاب) بکرێت. ئەمەش ماوە و زەمینەی لەباری دەوێت، پێویست بەوە دەکات زەمینەی دیموکراسیانەو مۆدێرنی بۆ ساز بکرێت. بە لولەی چەک و عەقلییەتی میلیشیایەتی ئازار و زیانەکانمان یەکجار زیاد دەبن!

دەمێکە کاتی ئەوە هاتووە کە سەرکردایەتی **(ی.ن.ک) و (پ.د.ک)** واز لە هەڵوێستە گرژو توند و تیژەکانیان بهێنن. بەجەرگانە بگەنە رێککەوتنەوە لەگەڵ یەکتر. بەڕاو بۆچوونم کاک مەسعود بارزانی و مام جەلال بەرپرسیاری یەکەمن بەرامبەر بە مێژوو و نەتەوەکەیان و پێویستە لەسەریان لە پێناوی خەڵکی کوردستان لاپەڕەی تازە لە نێوانیاندا بکەنەوە و باڵی ئاشتی و برایەتی و حکومەتی یەکگرتوو بگێڕنەوە بۆ کوردستانی باشوور. خۆ ئەگەر بێت و هەر دوو لایان پێکڕا دەست لە ناو دەست، بە ئاشکرا لە ئامێرەکانی رادیۆ و تەلەفیزیۆن و رۆژنامە و بلاوکراوەکان، دان بنێن بەو کردەوە چەوت و خراپانەی کە دووچاری خەڵکی کوردستانیان کردووە، بەڵێن و پەیمان بدەن کە ئەوەی رۆیشت نابێت جارێکی تر لە هەرێمەکە روو بداتەوە، داواش لە خەڵکی کوردستان بکەن لە مەودوا، بە دەنگدانی دیموکراسیانە، بەرەخنەگرتنی درووستکەر رەفتار لەگەڵ هەڵوێست و کردەوکانیاندا بکەن. بەم کارە نرخ بۆ خۆیان و پارتەکانیان زیاد دەکەن. ئەمە دەبێتە سەرەتایەکی مۆدێرنانە و یاریدەدەر بۆ پێشکەوتنی راو و بۆچوونی خەڵک. خۆشی و شادی دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان، گیان دەگەڕێتەوە بەرەو ئەو تروسکە هیوایەی کە ماوە و سەر لە نوێ گەشە دەکاتەوە.

لە هەمان کاتیشدا هێز و پارتەکانی کوردستان، نووسەر و رۆشنبیران، بە دڵسۆزی داوا لە سەرکردایەتی **(پ.ک.ک)** بکەن کە هێزە چەکدارەکانی خۆی لە باشوورەوە بگوێزێتەوە بۆ باکوور، دەست بە گفتوگۆی ئاشتییانە بکرێت لە نێواندا، لە سەر باشترین شێوەی خەباتکردن، رێککەوتن پێک بهێنرێت، هەڵسوکەوتەکانیان بگەڕێننەوە بۆ بەرژەوەندی نەتەوایەتیی. هەموو کوردیش دان بەو راستییەدا بنێت، کە هەموو کوردێکی تێکۆشەر و دەربەدەر و ئاوارە بۆی هەیە و مافی خۆیەتی لە باشووری کوردستان پشوو بدات و بحەسێتەوە و بە ئازادی بژی، بەو مەرجەی رێزی یاساو بڕیارەکانی حکومەتی یەکگرتووی هەرێمەکە بگرن.

## هەوڵدان بۆ درووستکردنی ئەڵتەرناتیڤی سیاسی باشتر و پاکتر و دیموکراتیتر



**عومەر شێخموس:** لە وەلامی پرسیاری دووەمدا دەڵێم، کەبۆ بەرژەوەندی کوردستان و سیاسەتی کوردی بەڕای من، خەڵک دەتوانن لەم رۆژەدا چەند هەنگاوێکی گرنگ بنێن، تا رێگا نەدەن بەو پرۆسە خراپانەی کە کەوتوونەتە ناو گیانی هێزەکانی کوردستانی و سیاسەتی کوردییەوە. ئەو هەنگاوانەش ئەمانەن:

- هەڵوێست وەرگرتنێکی بە پرنسیپیانە **(مبدا)**ی دژی هەموو کارێکی ناپاکی کە لەلایەن هەر هێزێکی کوردستانییەوە بکرێت. بەمە رێگا لەو جۆرە کارە نابەجێیانە دەگیرێت کە لە ئایندەدا روودەدەن.
- فشارهێنان بەکاری جەماوەریانە، وەک (خۆپیشاندان، مانگرتن، بۆیکۆت "مقاطعـــة") ئەمیش بە مەبەستی راگرتنی شەڕی ناوخۆ و گەڕانەوەی هێزەکانی کوردستان بۆ سەر رێگای پرۆسەی (دیموکراسی، هەڵبژاردن و کۆمەڵگای یاسا و مەدەنی).
- هەوڵدان بە مەبەستی جولاندنی رای گشتی جیهانی و دەزگاکانی پاراستنی دیموکراسی و مافی مرۆڤ. هاندانی ئەم دەزگایانەش بۆ بەگژاچوونەوەی ئەو هێزە کوردییانەی کە لەکاتێکدا مافی مرۆڤ پێشێل دەکەن و لە پرنسیپە بنەڕەتییەکانی دیموکراسی لادەدەن.
- هەوڵدان لەگەڵ هێندێ شەخسییەتی سیاسی جیهانی و ئەو دەوڵەت و حکومەتانەدا کە دۆستی گەل و جەماوەری کوردستانن، تا ئەوانیش دەسەلات(نفوذ)ی خۆیان بەسەر هێزەکانی کوردستان و ئەو حکومەتە

مەرکەزییانەشدا کە گەلی کورد لە نێوانییاندا دابەش کراون بسەپێنن و پرۆسەی ئاشتی بخەنە گەڕ. هەروەها تێکڕا لە ڕێگای گفتوگۆی مەدەنییانەوە چارەسەرێکی باش و دروست و ڕەوا بۆ گیروگرفتەکانی کورد بدۆزنەوە.

- هەوڵدان بۆ دروستکردنی ئەڵتەرناتیڤی سیاسی باشتر و پاکترو دیموکراتیتری کوردیی ◆

---

ئەو سەرچاوانەی کە کاک حەمە سەعید حەسەن لە وەلامەکەیدا دەستی بۆ ڕاکێشاون ئەمانەن:

{1} لە شیریی هەتا پیریی سەعد عەبدوللا. لاپەڕە 68، چاپخانەی ڕۆشنبیریی هەولێر 1998 .

{2} سوودی لە قسەیەکی هێرمان هێسە وەرگرتووە.

{3} الروح الحیە- جیل الستینات فی العراق، فاضل العزاوی، لاپەڕە 220، دار المدی دمشق 1997.



**فاتح رەسول**

1931/2/22 لە کۆیە لەدایک بووە . چۆتە ریزی پارتی کۆمونیستی عێراقەوە (حشع) . سالی 1960 پالێوراوە و بووە بە ئەندامی لیژنەی هەرێمی کوردستان . چەند جارێک بەند کراوە . سالی 1961 بە نهێنی بووە بە بەرپرسیاری رێکخراوەکانی حشع لە فیرقەی 2ی کەرکوک . لەسالانی 63ـ 68 کەوتۆتە چیاکانی کوردستانەوە . سالی 1968 بۆ خوێندنی (مارکسیزم-لینینزم) بۆ فێرگای زانیاری کۆمەلایەتی بۆ مۆسکۆ نێردراوە . سەرەتای 1970 بەنهێنی بۆ عێراق دەگەرێتەوە دەبێت بە بەرپرسیاری رێکخراوەکانی (حشع) لە کەرکوک . لە ناوەراستی 1972 دەبێت بە ئەندامی کۆمیتەی هەرێمی کوردستانی (حشع) ، سالی 1975 یش دەکرێت بە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزیی . لە سەرەتای 1979 رادەکاتە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان و تا سالی 1986 دەمێنێتەوە . حوزەیرانی 1986 دەچێتە سوریا . لە دیمەشق ئەندامی لیژنەی پەیوەندییەکانی نیشتمانی (حشع) دەبێت و سالی 1989 لە سوید دەبێتە پەنابەر . ئیستاش خانەنشینە . ژمارەیەک نووسین و کتێبی چاپکراوی هەیە .



**عومەر شێخموس**

* 1942 لە شاری عامورەی کوردستانی سوریا لەدایک بووە .

* سالی 1958 بووە بە ئەندامی (پدک) کەلەمانگی (8)ی (1957) دا دامەزرابوو .

* لە سالی (1963)دا بۆ خوێندن دەچێتە ئینگلتەرە .

* ئەندامی رێکخراوی هاوبەشی هەر سێ پارتیەکەی عێراق و سوریا و ئێران بووە .

* سالی 1967 هاتۆتە سوید .

* یەکێکە لە بەشدارانی دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان . لە نێوان سالانی 1978ـ1981 دا لە باشووری کوردستان لە ناو ریزی پێشمەرگەدا بووە .

* 1986 کە وازی هێناوە بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لێپرسراوی پەیوەندییەکانی دەرەوە .

* لە ئینگلتەرە بەکالۆریۆسی لە پەیوەندییەکانی نێونەتەوەییدا هێناوە . لە سویدیش سالی 1970ـ1972 ماستەری وەرگرتووە . لە سالی (1986)ەوە لە بنکەی لێکۆلینەوە لە کۆچکردن و پەیوەندی نەژادەکانی جیهانی لە ستۆکهۆلم کار دەکات .

* ژمارەیەکی زۆر وتاری بە زمانی کوردی، ئینگلیزی و سویدی بلاوکردۆتەوە .



**حەمە سەعید حەسەن**

* 1950 لە قەرەداغ لەدایک بووە .

* سالانی 1971ـ1976 ئەندامی حیزبی شیوعی عێراق بووە . وەک خۆی دەلێت لەگەل مۆرکردنی پەیماننامەی بەرەی نیشتیمانیدا ناکۆکی فیکری لەگەلدا پەیداکردوون .

* سالانی 1971ـ1981 مامۆستای قوتابخانە بووە لە شارەزوور و سلێمانی .

* لە نێوان سالانی (1979ـ 1982) دا ئەندامی دەستەی بەرێوەبەری یەکێتی نووسەرانی کوردی لقی سلێمانی و مەلبەندی گشتی بووە .

* سەرەتای 1983 لەسەر نووسین و هەلوێستی دووچاری راونان بووە و رووی کردۆتە شاخ .

* لە سالی 1988 گەیشتۆتە سوید و ئێستاش مامۆستای مندالانی کوردە .

* سەرنووسەری گۆڤاری خەرمانە بووە ، کە لەنێوان سالانی 1991 تا 1993 ، 10 ژمارەی لێ دەرچووە .

* ئەندامی یەکێتی نووسەرانی سویدە .

* حەڤدە بەرهەمی چاپکراوی هەیە کە بریتین لە دیوانی شیعر و رەخنە و لێکۆلینەوە و وەرگێران .

# ئەو جەوهەرە کولتوورییەی بەرپرسیارە لە شکستی کورد

× نیوەی ئەوەی دێتە کایەوە لایەنەکەی تر بڕیاری لەسەر دەدات
× لە کولتووری گەورەو پچوکییدا، سیاسەت دەسنیشانی ڕەوایی حوکمکردن ناکات، بردنەوەی ملکەچیی جەماوەرەکە بڕیاری لەسەر دەدات
× کێشەکە هەر ئەوە نییە کە دەسەڵاتدارێکی زۆردار مافی بڕیار دەخاتە دەستی خۆیەوە، بەڵکو ئەوەشە کە کەسەکانیش دەیانەوێت بێماڧیی خۆیان تەسلیمی ئەو دەسەڵاتە بکەن و ملکەچیی خۆیان ڕابگەیەنن
× با هەر کەس لەخۆی بپرسێت: چ خراپەیەک ماوە نەکرابێت؟ چاوەڕێی چی تر دەکەیت کە ئەگەر دەسەڵاتدارەکان کردیان تۆ دەڵێیت ئیتر بەس؟

**ناسر حەفید**



وێنەی مەلا مستەفا (١٩٠٣/٣/١٤ـ ١٩٧٩/٣/١)

١-حاجی حسێنە کوێری گوندی هەباسچەقەڵ حەکایەتێکی دەگێڕایەوە ئەمە کورتەکەی بوو: جارێک کوڕێک بە باوکی دەڵێت بابە عەولا قاچی مریشکێکی شکاندووم. باوکە دەیکات بە هەراو دەڵێت: تۆش بڕۆ قاچی مانگایەکی بشکێنە. کوڕە دەڵێت؛ بابە چۆن پیاو لەسەر قاچی مریشکێک قاچی مانگایەک دەشکێنێت!

ماوەیەکی پێ دەچێت کوڕە دێتەوە لای باوکی و دەڵێت؛ بابە ئەم جارە عەولا قاچی مانگایەکی شکاندووم. باوکە قوشقی دەبێت، دەیکات بە هەراو دەڵێت؛ بڕۆ قاچی خۆی بشکێنە! کوڕە دەڵێت: ئاخر چۆن لەسەر قاچی مانگایەک قاچی زەلامێک دەشکێت؟ سێهەم جار کوڕە بەهەڵەداوان دێتە لای باوکی و دەڵێت: عەولا ئازادی کوڕمی کوشت چی بکەم؟ باوکە بە بێ ئەوەی خۆی تێک بدات، دەڵێت: هیچ. کوڕە دەیکات بە هەرا: تۆ لەسەر قاچی مریشکێک دەت کرد بە هاوارو قاچی مانگایەکت بە من دەشکاند، لەسەر قاچی مانگایەک دەتکرد بە فەرتەنەو قاچی زەلامێکت بە من دەشکاند، کەچی ئێستا لەسەر کوڕەکەم بێ دەنگی و دەڵێیت: هیچ مەکە! باوکە وەڵام دەداتەوە: کوڕم ئەگەر لەسەر قاچی مریشکەکەت بەدەنگ بهاتیتایە قاچی مانگاکەت نەدەشکا، ئەگەر لەسەر قاچی مانگاکەت کارێکت بکردایە ئێستا کوڕەکەت نەدەکوژرا. تازە هەموو دنیاش بکوژیت کوڕەکەت زیندوو نابێتەوە.
٢-هەر کەس لە خۆی ورد ببێتەوە دەبینێت هەندێک گفتوگۆ یاخود ڕازی دڵ هەیە لەگەڵ هەموو کەسێکی ناکات یان لای هەموو کەسێکی نادرکێنیت. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو گفتوگۆو ڕازی دڵانە خۆیان لەگەڵ گشت کەسێک دروست نابن. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە ئەوەی دێتە کایەوە تەنها تۆ بڕیاری لەسەر نادەیت، بەستراوە بە لایەنەکەی تریشەوە. کێشەکە هەر ئەوە نیە تۆ چی بۆ یەکێک باس دەکەیت، بەڵکو ئەوەشە کە ئەو چی لە تۆ دەردەهێنێت، لەگەڵ تۆدا چ باسێک دروست دەکات. بۆیە، مەرج نیە ئەو کەسەی زۆرتر تۆ دەبینێت زۆرتر تۆ بناسێت. لەسەر ئەوە وەستاوە ئەو چی لە تۆ دەوێت و تۆ دەتوانیت لەو شتانەی کە ئەو دەیەوێت چی بدەیتێ. ئەدیبێک هاوسەرەکەی هەرچەندە هەموو ژیانیشی لەگەڵدا بردبێتە سەر، بەڵام لە ئەدیبیی ئەو بە قەدەر ئەوە دەزانێت کە

ئەوەندە ئەدەبی لەو ویستبێت. بۆیە مەرج نیە ئەو کەسەی لەگەڵی دەژیت، یان هەموو ڕۆژێک دەی بینیت لە کەسێکی تر بەئاگاتر بێت لە تۆ.

٢-هەمان مادەی کیمیاوی جیابەجیا لەگەڵ دوو ماددەی جیاوازدا دوو ئەنجامی جیاواز دەدات بە دەستەوە. هەمان کەسیش لەگەڵ دوو منداڵی خۆیدا دوو پەیوەندی جیاواز دێنێتە کایەوە. ئەم پەیوەندییە جیاوازەش ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تۆ جیاوازیی لە نێوانیاندا دەکەیت، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جیاوازیی ئەوان لە گەڵ هەمان تۆدا پەیوەندییەکی تایبەت بۆ هەر یەکێک لەوان دروست دەکات. لە پەیوەندیی ژنومێردیشدا، ئەوی تر لەسەر ئەو حسابە لە گەڵتا دەجوڵێتەوە کە تۆ چیت بۆ خۆت لای ئەو داناوە. من خۆم نیوەی ئەوەم کە یەکێکی تر بەرامبەرم دەی کات. کورد دەربارەی ڕۆڵی خراپی لایەنی دووەم خۆی، لەوەدا کە لایەنی یەکەم بەرامبەری دەیکاتەوە، دەڵێت: "مریشک خۆی خۆڵ نەکات بەسەر خۆیدا کەس ناتوانێت خۆڵ بکات بەسەریدا". مەبەستیش لەمە ئەوەیە کە یەکێک خەتای خۆیەتی کە بەو جۆرە لەگەڵیدا دەجوڵێنەوە. لێرەدا دەتوانم بڵێم: هەر یەکە لە ئێمە ڕۆژانە چەندەها جار خۆی لە ئاوێنەی هەڵوێست و کاردانەوەی کەسەکانی بەرامبەریدا دەبینێت، بەڵام هەیە بە دەگمەن یان زەحمەتە خۆی تیایاندا بناسێتەوە، لەوە تێ بگات کە ئەو وێنەیەی ڕەنگە لەو نەچێت، ئەوە لەو شتەدا کە بەرامبەر هەڵسوکەوتی خۆی لەوی بەرامبەریدا دروست بووە.

٤-پرسیاری چاک دەیەوێت وەڵامی چاک دروست بکات. بەرهەمێکی ئەدەبیی بەهێز دەرفەتی ڕەخنەیەکی دەوڵەمەندیش لەگەڵ خۆیدا دێنێتە کایەوە. من لەمسەری مێزەکەوە تۆپەکە لێ دەدەم بۆ ئەو کەسەی ئەو سەر. ئەوەی ئەوسەر، ئەگەر خاڵە بنەڕەتییەکانی تێنس نەزانێت، ناتوانێت تۆپەکە لێ بداتەوە بۆ ئەمسەرو سەرئەنجام تێنس دروست نابێت. چۆن یاری بالە دروست دەبێت کاتێک ئەوەی ئەو سەر کە تۆپەکەی بۆ چوو، لەجیاتی ئەوەی بەدەست لیی بداتەوە بۆ ئەمسەر، شەقێکی تێ هەڵ بدات بۆ دەرەوە؟ لەسەر هەمان پرنسیپ، کاتێک کە ڕەخنە لە بەرهەمی یەکێک دەگرم، تازە ئیتر تۆپەکە لە دەستی مندا نەماوە، نیوەکەی تر ڕەخنە لێگیراوەکە بڕیاری لەسەر دەدات. ئایا زانیارانە وەڵام دەداتەوەو گفتوگۆ دروست دەکات، یان شەقێکی تێ هەڵ دەدات و ناتوانرێت گفتوگۆی لە گەڵدا بکرێت؟ لەم حاڵەتانەدا مرۆڤ دەبێت بەئاگا بێت پەتی مەسەلەکەی لە دەست دەر نەچێت. ئەگەر تۆ یەکێکی دەتەوێت گفتوگۆ بهێنیتە کایەوە، گرنگە جنێوەوەڵامی ئەوی تر هەدەفەکەی خۆتت پێ نەگۆڕێت و نەتبات بەرەو ئەو شوێنەی کە ئەو دیاری دەکات.

٥-سپێرمی پیاو هەر چەندە لە ڕوی قەبارەوە زۆر بچوکترە لە هێلکەی ئافرەت، بەڵام نیوەی ماددەی بۆماوە، کە ٢٣ کرۆمۆسۆمە، بۆ دروسکردنی خانەیەکی تۆودار لە سپێرمەکەوە دێت.

بەو نموونانەی سەرەوە دەمەوێت بڵێم چی؟ ئەو نموونانەی باسم کردن چەند لە ڕوی فۆرمەوە جۆراوجۆر بن، بەڵام هەموویان لە ڕوی فەلسەفییەوە (لە جەوهەردا) لە یەک خاڵدا یەک دەگرنەوە کە ئەمەیە: نیوەی ئەوەی دێتە بەرهەم لایەنەکەی تر بڕیای لەسەر دەدات.

## خەتای سەرکردەی حیزبەکانی تیا نەماوە

شەمەنەفەری مێژوو مەحاڵە تەنها لەسەر تاکەسکەی دەسەڵاتدارەکانی بڕوات، سکەکەی تری خەڵکەکەیە. بەم پێیە ئەوەی کە سەرکردەی هێزو حیزبەکان بەسەر کوردیدا دەهێنن نیوەی کێشەکەیە، نیوەکەی تری لایەنەکەی تر، کە خەڵکەکە دەگرێتەوە، لیی بەرپرسیارە. واتە، مەسەلەکە هەر ئەوە نییە کە سەرکردەی هێزو حیزبەکان چی دەکەن، بەڵکو ئەوەشە ئەی ئێمە وەکو لایەنی دووەم هەڵوێست و کاردانەوەمان بەرامبەر بە ڕووداوەکان چییە؟ ئایا پۆزەتیڤ ڕێگا لە خراپەکان دەگرین یان نێگەتیڤ پشتگیرییان دەکەین؟ باشەکان دەپارێزین و گەشەیان پێ دەدەین یان دەیان فەوتێنین و کوێریان دەکەینەوە؟ کاتێک کە خیانەتێک دەکرێت ڕادەپەڕین بەرامبەری یان خۆمانی لێ مت دەکەین و بیانووی بۆ دەهێنینەوە؟ ئەقڵمان بۆ سەربەستیی و ماف و ڕزگاریی بەکار دەهێنین یان بۆ ژێردەستیی و بەندیی و ملکەچیی؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە بەگشتی، دەکەونە سەر کامە خەتیان، پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ، ئەوە ئەو خەتەیە کە پیشانی دەدات ئێمە چ خەڵکێکین، خەڵکی ماف و سەربەستیی و ڕێزلێنان یان غەدرو سوکایەتی پێکردن و ژێردەستیی؟

ئەوەی کەرەسەی تێگەشتنێکی زانستییە ئەو شتە ماددی و بەچاوبینراوانەن کە دەتوانرێن بخرێنە حسابەوە. ئەو خیانەت و تاوان و خراپەکارییانەش کە بە چاو دەبینرێن شایەتێکی ڕوون و گومان لێنەکراوی ئەوەن کە مێژووەکە لە سەر هێڵێکی نێگەتیڤ دەڕوات. ئەم هێڵە شکستە مێژووییەش تەنها خراپیی و تاوانکاریی دەسەڵاتدارەکانی پیشان نادات، بەڵکو ئەوەش دەگەیەنێت کە خەڵکەکەش، لە سەروو هەموویانەوە نووسەرەکانی، بە چ شێوەیەک بەشدار و بەرپرسیارن لەو ڕەوتەدا کە مێژووەکە لەسەر هێڵی شکست دەڕوات.

ئێستا لەبەردەمی ئەو پرسیارەدا دەوەستین کە ئایا بۆ لایەنی دووەمی کێشەکە کە خەڵکەکەیە سکەی دووەمی مێژوویەک دروست دەکات کە مێژووی تیاچوون و فەوتاندنی خۆیەتی؟

## هەڵەی مێشک نییە، هەڵەی بەکارهێنانێتی

تا ئێستا هیچ ڕاستییەکی زانستیی ئەوە پیشان نادات کە هۆی ئەوەی خەڵکەکە تەواوکەری ئەوە بێت کە دەسەڵاتدارەکانی بڕیاری لەسەر دەدەن، بگەڕێتەوە بۆ مێشک نەک بۆ ئەقڵ. هەرچەندە کەسانی ڕەگەزپەرست هەوڵ دەدەن جیاوازییەکی بایۆلۆجیی لە نێوان ڕەگەزە جیاوازەکاندا بدۆزنەوە، بەڵام بەڵگەیەکی زانستیی لەو جۆرە نیە کە پیشانی بدات مێشکی نەژادەکانی خەڵک (بۆ نموونە؛ کورد، فەرەنسیی، عەرەب، ئینگلیز،.. سپی، ڕەش،..) لە ڕووی بایۆلۆجییەوە جیاواز بن. بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەو وتارەی "هێمن" لەم ژمارەیەدا نووسیویەتی، ئەوە پیشان دەدات کە خەڵکی هەمان ناوچە لە دوو زەمەنی جیاوازدا، لە ڕووی داهێنانەوە لە دوو سەرتۆپی پێچەوانەی یەکترییدا، باڵا و نشێو، خۆیان دەبیننەوە. بە پێی ئەو وتارە، کۆنترین شوێنەواری گەنم لە جیهاندا لە باشووری کوردستاندا دۆزراوەتەوە. لە هەمان ناوچەدا، بە هۆی کشتوکاڵ و مەڕماڵیکردنەوە خەڵکی ئەم ناوچەیە توانیویانە کۆنترۆڵی خواردنی خۆیان بکەن و سەرەتاترین نیشتەجێبوون دروست ببێت و بنچینەی شارستانی دابمەزرێنن. کەچی ئەو شوێنەی بۆ یەکەم جار گەنمی تیادا چێنراوەو مەڕی لێ ماڵی کراوە، ئێستا دوای ٩٠٠٠ساڵ FN نان دەکات بە دەمی دانیشتوانەکەیەوە. لەبەر ئەوە مەسەلەکە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە پەیوەندی بە ئەقڵەوە هەبێت نەک بە مێشک. مەبەستیشم لە ئەقڵ لێرەدا ئەمەیە: چۆنێتیی بەکارهێنان یان بەکارنەهێنانی مێشک.

بۆیە بە گوێرەی ئەم بنەمایە دەتوانین بڵێین: جیاوازیی ئەقڵی میللەتان ناگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی بایۆلۆجیی مێشکی کەسانی ئەو میللەتانە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی بەکارهێنانی مێشک لە لایەن ئەو خەڵکانەوە. ئەوەی دەستنیشانی چۆنێتی بەکارهێنانی مێشکیش دەکات، دیارە کۆمەڵێک فاکتۆرە کە ئەوەش بابەتێکە بۆ خۆی. بەڵام سەرئەنجامی ئەم کۆمەڵە فاکتۆرە لە شتێکدا بەگشتی خۆی دەنوێنێت کە پێی دەوترێت کولتوور. کەواتە لێرەدا کولتوور

بریتیە لە سەرجەمی گشتیی بەکارهێنانی ئەقڵی کۆمەڵایەتیی کە لە بوارە جیاوازەکانی وەکو سیاسەت، ئەدەب، هونەر، دابونەریت، زەوق و مۆدێل، هەڵسانودانیشتندا خۆی دەردەبڕێت.
بەم شێوەیە دەگەینە ئەوەی کە هۆی ئەوەی خەڵکەکە تەواوکەری تیاچوونی خۆیەتی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەقڵی کۆمەڵایەتیی (سەرجەمی گشتیی چۆنێتی بەکارهێنان یان بەکارنەهێنانی مێشک). ئەم ئەقڵی کۆمەڵایەتییەش لە کولتووردا بەگشتی ڕەنگ دەداتەوە، لە دیاردەو هەڵوێستەکاندا دەردەکەوێت و لە بەرهەمە ماددییە جیاوازەکانیشدا بەرجەستە دەبێت.
پاش ئەوەی دەسنیشانی ئەو شوێنەمان کرد کە وەڵامی پرسیارەکەی تێ دەکەوێت کە "ئەقڵی کۆمەڵایەتییە"، دێینە سەر ئەوەی کە ئایا لەناو ئەم ئەقڵی کۆمەڵایەتییەدا کامەیە (هۆ)یەکە؟
هەروەکو چۆن بۆ ئەوەی بتوانین قوماشێک ببڕین، دەبێت دەستیاوێکی گونجاوی وەکو مقەستمان بە دەستەوە بێت، ئاواش بۆ ئەوەی بگەینە وەڵامێکی چاک دەبێت پرسیارێکی چاک دروست بکەین. درووسکردنی پرسیارێکی لەباریش بۆ ئەم وەڵامە بەم شێوەیە ڕێچکە وەر دەگرێت:
پرسیار: بۆ ئەحمەد نابیستێت؟ وەڵام: چونکە ئەحمەد کەڕە. کەواتە: کەڕیی بەرپرسارە لە نەبیستن. پرسیار: بۆ مەحمود نابینێت؟ وەڵام: چونکە مەحمود کوێرە. کەواتە کوێریی بەرپرسیارە لە نەبینین. لەسەر هەمان پرەنسیپ ئەم پرسیارە دروست دەکەم: بۆ خەڵکەکە تەواوکەری ئەوەیە کە سەرکردەی هێزەکان بڕیاری لەسەر دەدەن؟ وەڵام: چونکە خەڵکەکە (س)ە. کەواتە: (س) بەرپرسیارە لەوەی کە لایەنی خەڵکەکە تەواوکەری ئەوەیە کە سەرکردەی هێزەکان بڕیاری لەسەر دەدەن؟ (س) ئەو خاڵەیە کە نازانین چییەو بە دوایدا دەگەڕێین. س چییە؟

## بڵاوەپێکردنەکەی ساڵی ١٩٧٥

من چەند فکری خۆم بخەمە کار بۆ ئەوەی باسی سەمای هونەرمەندێکتان بۆ بکەم، هیچی بەوە نابێت کە سەماکە خۆیتان پیشان بدەم. هەرچۆنێک هەوڵ بدەم تێتان بگەیەنم ئەم سێوە تامی چۆنە، بەوە نابێت سەرو لەتێکتان بدەمی خۆتان تامی بکەن. بۆیە بۆ ئەوەی باسەکە لەسەر پرەنسیپی قاوغ نەڕوات و زانستیی بێت نەک فیکریی، ئەو نموونانە دەهێنمەوە کە کولتورەکە خۆیانی تیادا دەر دەبڕێت و بوونێکی ماددییان هەیە.
ڕۆژی ٦ / ٣ / ١٩٧٥ ئێران و عێراق لە جەزائیر ڕێک کەوتن. دوای ٦ ڕۆژ، لە (٣/١٢)دا مەلا مستەفا شای ئێران لە تاران دەبینێت. لە نێوانی (١٣-٣/١٩)دا مەلا مستەفاو سەرانی پارتی چەند کۆبوونەوەیەک دەکەن. دوا ڕۆژ (٣/١٩) بڕیاری بڵاوەپێکردن دەدەن. بە نزیکەی حەوت ڕۆژ بزووتنەوەیەکی ١٤ ساڵیی کۆتایی پێ دێت (ل-٨٠، ١٠٤، ١٣٢/١).



ستۆدیۆ ڕەفیق. وێنەی مەلا مستەفا لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمی سەرکۆماری ئەوسای عێراقدا، دوای گەڕانەوەی لە سۆڤییەت، ڕۆژی: ٧/١٠/١٩٥٨.

## مـــاف نە دەدرێت، نە دەســەنرێت، شــتێکە دەبێت خــــۆت بیـــــدەیت بە خــــۆت

دەگێڕنەوە کادرێکی پارتی دەڵێت: *"ئێمە لەو منداڵە دەچین کە باوکی لەسەر دوکانەکەی بەجێی دێڵێت و پێی دەڵێت هەر کڕیارێک هات پێی بڵێ: ڕاوەستە تا باوکم لە مزگەوت دەگەڕێتەوە!"* ئەم کادرە ڕاستییەکی ئاڵۆزی بە زمانێکی ساکارو کۆنکرێت پیشان داوە.
مەلا مستەفا کە خاوەنی جوڵانەوەکەو بڕیاردەری بووە، نیوەی مەسەلەکەیە، نیوەکەی تری منداڵیی لایەنی خەڵکەکە دەگرێتەوە کە توانای بڕیاری نەبووەو چاوەڕێی باوکی کردووە لە مزگەوت بێتەوە. مەلا مستەفا دواتر لە ئێران وتی: *"کاری من تەواو بوو"*. ئەمە کاری ئەو، ئەی کامە بوو کاری خەڵکەکەی تر، بۆ بەردەوام نەبوو لەسەری؟
بزووتنەوەیەکی گەورە کە لە ڕووتێکردنێکی سیاسی بەهێزدا بوو، خەڵکەکەی لەو سەرەوە هاتەوەو قسەی بۆ ئەم ڕوداوە ئەمە بوو: *"مەلا مستەفا ئاشبەتاڵی کرد"*. ئەمە هەر ئەوە بە من ناڵێت کە بزووتنەوەکە هەموو شتێکی بەجێ هێشتبوو بۆ مەلا مستەفا، بەڵکو ئەوەش پیشان دەدات کە خەڵکەکەش هیچی بۆ خۆی دانەنابوو. بزووتنەوەکە بەم هیچ بۆخۆدانەنانە کە دەکاتە سفر، لە بەردەمی بڕیاری سەرۆکدا ڕادەوەستێت. هەروەکو چۆن حەوت سفری لێ دەرکەیت هەر دەکاتەوە حەوت، ئاواش بڕیاری بڵاوەپێکردن هیچ بڕیارێکی تری لە تەرەفی بزووتنەوەکەوە لێ دەر نەکراوە تا ئەنجامەکەی نرخێکی تر، جیا لە بڵاوەپێکردن، بدات بە دەستەوە. بەم پێیە:
١- بزووتنەوەکە بە "هیچ بۆخۆدانەنان" و ڕێگا تەختکردن نیوەبەشی بڕیارەکەی خۆی، کە ئاشبەتاڵە، دەدات.
٢- ئەوەی کە لایەنی خەڵکەکە خۆی خستۆتە دەستی دەسەڵاتی سەردارێکەوە (بارزانی)، ئەوە پیشان دەدات کە پەیوەندیی نێوان لایەنی خەڵک و دەسەڵات، پەیوەندییەکی تەواوکەرانە بووە نەک پەیوەندی کۆنتراکت. واتە، لایەنی خەڵکەکە تەواوکەری ئەوە بووە کە لایەنی دەسەڵاتدار بڕیاری لەسەر داوە. تۆ ئەگەر مەڕ نەبیت شوانیشت نابێت. پەیوەندی دوو لایەنی کۆنتراکتێک نەبووە کە مەرج هەبێت لەنێوانیانداو هەر کاتێک دەسەڵات لەو گفتانە لای دا کە چۆتە ژێری، خەڵکەکە بەرامبەری بوەستنەوە. بۆ نموونە ڕەوایی سیاسیی نەمێنێ و سەرکردایەتییەکی تر جێگای بگرێتەوە.
ئەی هیچ بۆخۆدانەنان و خۆ خستنە دەستی سەردارێکی دەسەڵاتدارەوە، چی دەگەیەنێت، نیشانەی چییە؟

## بێمافیی

ئەمە ڕێکەوت نییە کە بە(بارزانی) یان دەوت: "باوکی کورد". بەوەی کە کارخانەی کولتووریی خەڵکێک باوکێک بۆ خۆی درووست دەکات، کەسەکانی خۆیان دەخەنە دەستی یەکێکی ترەوە. بەمەش کە کەسەکانی خۆیان دەخەنە دەستی یەکێکی ترەوە، ماف لە خۆیان دەسەننەوە. باوک ئەو کەسەیە کە کەسێک دەخاتەوە، یان کەسێک بەخێو و پەروەردە دەکات. باوکێکی تر ئەگەر هەبێت ئەو کەسەیە کە

ستۆدیۆ ڕەفیق. لای ڕاستەوە: جەلال تالەبانی، عەلی عەسکەریی، ئیبرایم ئەحمەد، کاکە زیاد، عومەر دەبابە.

---

تۆ بێمافیی خۆتی تەسلیم دەکەیت. ئایا ئەم کەسە دەبێت کێ بێت؟ ئەم کەسە دیارە دەبێت یەکێک بێت لەوانەی تر جیاواز. ئەم کەسە لە بواری سیاسیدا مرۆڤێک دەگرێتەوە کە لە هەموو بەهێزتر بێت. بەهێزێک کە بتوانێت هەمووان تێک بشکێنێ و ملکەچییان بباتەوە. ئەم حاڵەتە لەم هۆنراوەیەی "**هەژاری موکریانی**"دا، کە بۆ بارزانی وتووە دەناسرێتەوە. هەژار لەم دێڕانەدا، لە مەلا مستەفا وێنەی مرۆڤێکی تێکشکێنەرو بەهێزی دروست کردووە:

کێیە؟ تاجیکە، ترکی تۆرە، عەرەو  گێلە جاشە، تەعالە، گێتە، برەو ناوی

تۆی بیستبێ و نەترسابێ  یان هەناو و زراوی پێ مابێ (٢/٦)

**نەوشیروان مستەفا** دەنووسێت: "پارتی دوای ئەوەی لە کۆنگرەی یەکەمی دا مەلا مستەفای هەڵبژارد بە سەرۆکی خۆی، لە دو کۆنگرەی تریشی دا: کۆنگرەی دوەم (مارتی ١٩٥٠ لە بەغداد) و کۆنگرەی سێهەم (کانونی دوەمی ١٩٥٣ لە کەرکوک)، سەرۆکایەتیەکەی نوێ کردەوە. بە درێژایی ئەو ماوەیەی مەلا مستەفا لە یەکێتی سوڤیەت بو (١٩٤٧-١٩٥٨) بێ ئەوەی سەرکردایەتی پارتی و مەلا مستەفا ئاگایان لە یەکتری بێ، پارتی پروپاگەندەیەکی بەربڵاوی بۆ مەلا مستەفا ئەکرد."

نەوشیروان مستەفا دەربارەی ئەم ڕەوتەی پارتی دەڵێت: "بێگومان ئەمە نیشانەی لاوازیی کەسایەتی سەرکردەکانی ئەوسای پارتی بووە، کە هیچیان بە خۆیان دا ڕانەئەپەرمون سەرۆکایەتی پارتی و، سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد بگرنە دەس و، بۆ کەسایەتیەکی نە خوێندەواری خێڵەکەی دور وڵاتی چارەنوس نەزانراویان بەجێ هێشت بو (٣/٥٤).

بەڵام ئایا هۆی "لاوازیی کەسایەتیی" و "لەخۆڕانەپەرمان"ی سەرکردەکانی ئەوسای پارتی چی بووە؟ من وام نایەتەبەر چاو وەڵامی ئەم پرسیارە سایکۆلۆجی بێت (واتە پەیوەندی بە کارەکتەری کەسایەتیی هەر یەکێک لە سەرکردەکانی ئەوسای پارتییەوە بێت). بەڵکو گەشتوومەتە ئەو ئەنجامەی کە هۆیەکە بگەڕێتەوە بۆ "سایکۆلۆجی کۆمەڵایەتیی"، واتە خۆبەستنەوە بە مەلا مستەفاوە پەیوەندی تەنها بە کارەکتەری کەسایەتیەوە نەبووە. بواری قسەم لەم وتارەدا دیاریکراوە، بەڵام بە کورتی دەتوانم بڵێم: هیچ شتێک ئەوە پیشان نادات کە ئەگەر نەوشیروان مستەفا، من یان هەر یەکێکی تریش لەو سەرکردایەتیەدا بووایە، وەکو ئەوان هەر چاوەڕێی مەلا مستەفای نەکردایە. جەوهەری بابەتەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوە ئێمە نین سەرۆکێک هەڵ دەبژێرین بۆ جوڵانەوەیەک، بەڵکو جوڵانەوەکە خۆی لە ڕێگای ئێمەوە کە بەشێکین لە جوڵانەوەکە، یەکێک هەڵ دەبژێرێت.

سرووشتی جوڵانەوەکە هەمیشە دەسنیشانی ئەوە دەکات کە ئەو کەسە کێ بێت یان کێ نەبێت. لە هەمان کاتدا، کەسی هەڵبژێردراویش نیشانەیەکە، کە سرووشتی جوڵانەوەکە پیشان دەدات. لەشی حاجی لەقلەق سەری پڵنگ وەرناگرێت.

پارتی و سەرکردەکانی، مەلا مستەفایان نەکردووە بە سەرۆک بۆ ئەوەی سیستێمێکی سیاسی بەڕێت بەڕێوە، بەڵکو لە ناوەڕۆکدا بۆ ئەوە گەڕاون سەردارێک دروست بکەن، خۆیان بخەنە دەستییەوەو بێمافیی خۆیانی تەسلیم بکەن. بۆ ئەم مەبەستەش لە بارزانی چاکتر کەسێکی تر نەبووە. چونکە بارزانی، جگە لە ڕابوردووی جەنگاوەریی بارزان و مەهابادی، بە حوکمی عەشایەرییش، کە وێنەیەکی سیاسی بەڕێوەبەرانەی تری لە خەیاڵدا نەبووە، لە ڕووی ڕۆحییەوە یەکدڵ و یەکڕێ بووە بۆ پڕکردنەوەی شوێنی دەسەڵاتدارێکی سەردار.

نەوشیروان مستەفا دەنوسێت: "مەلا مستەفا بۆ ئەوەی بەشداری کۆنگرە نەبێ یان خۆی قورس ڕابگرێ کەڕا بوەوە بارزان. دەستەیەک لە نوێنەرانی کۆنگرە چون بە دوی دا بۆ بارزان و، بە هەزار تکا و پاڕانەوە ئینجا ڕازیان کرد بێتە کۆنگرە، کە هات بویش وت بوی: حەز دەکەم سەرۆکی قەحبە بم و سەرۆکی ئێوە نەبم! حەز ناکەم ...!" (٣/٥٨)

دارسێو بە ڕێکەوت سێو ناگرێت. ئەو کارخانە کولتوورییە بێ بناغە مەلا مستەفای نەکردووە بە سەرۆکی "پارتی". بۆیە ئەو جنێوە بە ناوبانگەی سەرەوە کە لە کۆنگرەی پێنجەمی ساڵی (١٩٦٠)دا داوێتی بەوانەی هەڵیان بژاردو قبوڵکردنی لە لایەن ئەوانەوە، ئاسایی بووەو جێگای ڕەخنە نییە. مەلا مستەفا بەو جنێوە وەسڵی ئەوەی داونەتێ کە بە بچووک و ژێردەستەی خۆی وەری گرتوون، ئەمەش ئەوە بووە کە ئەوان لە ناخدا لە دووی گەڕاوون. ئیتر ئەو هۆکارەی هێناویانەتەوە بۆ قبوڵکردنی ئەو جنێوە، کە بریتی بووە لەوەی قاسم ویستویەتی پارتی لەت بکات و ئەمان یەکێتی ڕیزەکانی پارتییان پارستووەو نەیان هێشتووە پیلانی قاسم سەر بگرێت، قسەیەکی فکریی بەتاڵ بووە. ڕووداو باشترین شایەتی ڕاستیی هەر مەسەلەیەکە. ئەوەی کە ئێمە لامان وایە، یان چاوەڕوانی ئەوە دەکەین بەردێک سەرئاو بکەوێت هەڵەی خۆمانە. ڕێگا هەمیشە زۆرە، پارتی ئەگەر نەفەری ڕێگایەکەی تر بووایە دەیگرت. نەوشیروان مستەفا دەنووسێت: "ئەو ڕۆژە مەلا مستەفا ئەیویست گەورەیی خۆی و بچوکی ئەوان بسەلمێنێ (٢/٥٨). بەڵام ڕەنگە نەوشیروان مستەفاش لاریی لەم تەفسیرەیان نەبێت کە هەر مەلا مستەفا نەبووە ویستوویەتی گەورەیی خۆی بسەلمێنێت، بەڵکو حیزبییەکانیش ویستوویانە بچوکیی خۆیان پیشان بدەن.

ئەم دیاردەیە کە بەستراوە بە جەوهەرێکی کولتوورییەوە پێشتریش هەبووە، دواتریش بینراوەو ئێستاش لە ڕاستەوە بۆ چەپ، هەریەکەیان لەژێر فۆرمی تایبەتی خۆیدا، لە کوردایەتیەوە بۆ کۆمۆنیزم، دەری دەخەن. هەبوونی ئەم دیاردەیە لەبواری سیاسیدا، نەبوونی "سیستێمی سیاسیی" دەگرێتەوە کە لەناو کۆمەڵگاو خەڵکی بێمافدا کەس و کەرەسەی قاتییە.

## هەڵەوێنە

مەبەستم لە هەڵەوێنە ئەوەیە کە وێنەیەک بۆ کەسێک یان کێشەیەک لای خۆت دروست بکەیت کە ئەو وێنەیە دوور بێت لە ڕاستی ئەو کەسە یان ئەو کێشەیەوە. بۆ نموونە زۆر جار خۆشەویستیی لەسەر بناغەی هەڵەوێنە دروست دەبێت. مرۆڤ لای خۆیەوە لە حەزو چاوەڕوانییەکانی خۆی وێنەیەک لای خۆیەوە دروست دەکات و دەینێت بەوی ترەوە بە بێ ئەوەی ڕاستیی ئەوی تر بەشداریی کردبێت لە درووسکردنی ئەو وێنەیەدا. ئەم وێنە خەیاڵییە لە حاڵەتی لێک دووربووندا دەگاتە پلەی شەیدایی و لە بەیەک نەگەشتنیشدا دەبێت بە حەسرەتێک و لە ڕۆحدا دەمێنێتەوە. بەڵام لە حاڵەتی بەیەکگەیشتندا، جیاوازیی نێوانی وێنەکەو ڕاستیی کەسەکە لە شێوەی بێ هیوایی و نەگونجاندا، لە پراکتیکدا وردە وردە خۆی دەر دەخات.
لە کۆمەڵگای دواکەوتوودا، کە باوەڕ تیایدا بەهێزە، هەڵەوێنە تەنها لە بواری خۆشەویستیی نادات کە کوڕو کچ ناسەربەستن و دەرفەتی ناسینی ڕاستیی یەکترییان نییە، بەڵکو لە بواری زانیارییش دەدات کە باوەڕ تیایدا خورت و باڵهاوێژە. بۆ نموونە مرۆڤ لای خۆیەوە، تەنانەت بێ ئەوەی پێویستی بەوە بێت لە کۆمۆنیزم تێ بگات چییە، وێنەیەکی خۆی لێ بۆ دادەتاشێت. کاتێک "ستالین" ناوی دەزڕێت دەڵێت کۆمۆنیست نەبوو، کە سۆڤییەت خراپ دەکەوێتەوە، دەڵێت سۆشیالیزم ئەوە نییە، کە کۆمۆنیزم لە هەموو دنیادا دەڕوخێت دەڵێت ئەوانە کۆمۆنیست نەبوون. لە ڕاستیشدا ئەوانەی تووشی هەڵەوێنە دەبن بە گوێرەی خۆیان ڕاست دەکەن کاتێک بەو شێوەیە دەفکرن. چونکە ئەو وێنەیەی ئەو لە سەریدایە وێنەی شتێک نیە کە لە دەرەوەی سەری ئەو هەبێت تا کە گۆڕانێک بەسەر شتەکەدا هات لە دەرەوە، ئۆتۆماتیکیی وێنەکەی سەری ئەمیش بگۆڕێت. ئەم بڕیاری تێنەگەشتنی خۆی داوە: "بشفڕێت هەر بزنە". ئەوەی دەڕوخێت سۆڤیەت و سیستێمی حوکمی وڵاتانە، نەک وێنەکەی سەری ئەم.

دەسەڵاتداری سەردار تا لە تارمایی بچێت باشترە. بۆ ئەوەی هەر کەسەو لە ئاستی خۆیەوە ئەو وێنەیەی پێوە بنێت کە لە سەری خۆیدا بۆی دروست کردووە. لەبەرئەوە، بوونی مەلا مستەفا لە دەرەوەی وڵات و دوور لە خەڵکەکەوە لە کوردستان، بوارێکی لەباری ڕەخساندووە بۆ ئەوەی پارتی بە گوێرەی پێویستیی ڕۆحیی خۆی و کولتوورەکە فۆرمێکی لێ درووست بکات. بۆیە ئەمەشیان بۆ پارتی جێگای خۆی بووە کە بە پێی نەوشیروان مستەفا، وەکو قارەمانی نیشتیمانی کوردو، کاوەی سەدەی بیستەم و، جەنەراڵی لەشکری سووری سۆڤیێتی، لە بەیان و وتارەکانیدا بە شان و شکۆی بارزانیدا هەڵی داوەو، وێنەکانی بڵاو کردۆتەوە(٥٤/٤). نەوشیروان مستەفا دەڵێت: "*مەلا مستەفا لای خەڵک کرا بو بە سەرکردەیەکی ئەفسانەیی لە شکان نەهاتو و، بگرە بە (بتێکی پەرستراو)*"(٣/٥٤).
کەسەکان بۆ ئەوەی ڕەوایی بدەن بە بێمافیی (پچوکیی) خۆیان ناچارن مافوەرگرەکەیان (گەورەکەیان) بە شێوەیەک لە شێوەکانی بیرۆزیی بنەخشێنن. هەڵەوێنەی کۆمەڵایەتیی ڕووەو ئەوە دەڕوات کە ئەو کەسەی بەرز دەبێتەوە، دەگاتە ئاستێک کە ئیتر نایەتە بەرچاو ئەویش مرۆڤ بێت. هەژاری موکریانی لەو هۆنراوانەدا کە بۆ بارزانی نوسیووە، بە ڕوونی ئەم حاڵەتە دەردەخات:

لەو ژێر سایە حەساینەوە          دەستەو لەحاز بووژاینەوە
لە بیر چوو یەخسیری و نەبوون          هاتینەوە سەر دنیای ڕوون
پاش مردن زیندوو بووینەوە          بەرەو ژین تێ هەڵچووینەوە
ئەو سایە چەورە لەسەرمان          بوو بە گەورەتر ڕێبەرمان
بە هێز و گوڕ ڕاپەڕاندین          کوردخۆرانی پێ بەزاندین

## ئەلتەرناتیڤ هەمیشە هەیە، ئەوەی نییە تۆ خۆتی کە دەست نادەیت بۆ شتێکی تر

بووینە نموونەی ئازادیی          بووینە لەشکری خودایی
ئەو شەنگە دارەی سەرچاوە          مستەفا بارزانیی ناوە
بەڵێ مستەفا بارزانی          هەموو کوردێک بە قوربانی (٢/٢٧)
لەو هۆنراوەیەدا کە بۆ ئیدریس بارزانی وتووە، ئاوا کۆتایی بە هۆنراوەکە دێنێت:
ژێر پێی بارزانی بێت سەرم          هەژارێکی بەختەوەرم (٣/٦٦)

بانگدانی ئەوەی کە مەسعود بارزانی بە چوونە ناو پەرلەمانەوە لە قودسییەتی کەم دەبێتەوە، دەرکردنی ئەم پیاوەیە لە سنووری ئاسایی مرۆڤ. مەسعود بارزانی ئەم بیرە لە خوتبەیەکییدا دەربارەی گرتنەوەی هەولێر، بەوە دەردەبڕێت کە خودا هەولێری گرتۆتەوە (٤) ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە ئەوەی ئەو کردوویەتی خودایی بووە. شتێکیش خودا بڕیاری لەسەر دابێت موتڵەقەو دەبێت سەرت لە ئاستیدا دابنەوێنیت. ئەو چۆن بیر دەکاتەوەو مرۆڤ وەکو چی دەبینێت، ئەوە بەجێی خۆی. باسەکەی من ڕوناکیی دەخاتە سەر لایەنی دووەم کە خەڵکەکەیە. بۆیە لێرەدا ئەو پرسیارە دروست دەبێت کە ئەمە چ خەڵکێکە کە لە کۆتایی چەرخی بیستەمدا دەتوانرێت قسەی لەو جۆرەی بۆ بکرێت و بەو چاوەوە تەماشا بکرێت؟ ئەم بیرەی ئەمڕۆ کورد لە چەرخی "ئینتەرنێت"دا قبوڵی کردووە، فەرەنسییەکان ٤١٨ ساڵ لەمەوبەر ئایینییەکانیان ڕاپەڕینیان بەرامبەر کردووە (٥/٣٥).
"**شێرکۆ بێکەس**" یش لە هۆنراوەی "بۆ بارزانی" دا، باسی ئەوە دەکات کە بارزانیمان بۆ مەرگ نەبێت، بۆ هەموو شتێکی تر دەوێت. هەر لە بەفرەوە بۆ شاخ تا وەکو گوللە بۆ چەکەکان. خەڵکێک هیچ بۆ خۆی دانەنێت، هەموو مافێکی دابێت بە دەسەڵاتدارەکەی، دەیان کارەساتی گەورەی تری وەکو ئاشبەتاڵ و ئەنفال و هەڵەبجەشی بەسەردا بێت، هەر ناتوانێت گۆڕانێک درووست بکات. چونکە بۆئەوەی دەسەڵاتدارەکانی بخاتە ژێر پرسیارەوە، دەبێت "ماف"ی هەبێت. مافیش شتێک نییە یەکێکی تر بە شرینقە بیخاتە سەرتەوە، دەبێت تۆ خۆت بیدەیت بە خۆت.
ئەوەی هەژار موکریانی و (شێرکۆ بێکەس)یش لەو هۆنراوانەدا لێی داوون، بێ گوێدانە پلەی خوێندەواریی، نموونەی ئەو کولتوورەن کە لە کوردستان و لە دەرەوە زاڵ و بەربڵاوە.

## جیاکرنەوە

ئەم باوکە کە لە بواری سیاسیدا دەسەڵاتدارێک دەگرێتەوە، تا زیاتر خۆی لە کەسانی ئاسایی جیا بکاتەوە، کەسە ئاساییەکان زیاتر دەتوانن خۆیان بخەنە دەستییەوەو هیچ بۆ خۆیان نەهێڵنەوە. بۆیە ئەوەی کە "مەسعود بارزانی" ناچێتە ناو پەرلەمانی خەڵکەکەوە، بە لۆژێکی نایەکسانیی و کۆمەڵگای سەرەتایی، بیرێکی ڕاستە. دەسەڵاتدارێک کە مافی هەموانی لە دەستدا کۆ ببێتەوە، چۆن دەبێت لە دەزگایەکدا کار بکات کە کەسە ئاساییەکان ئیشی تێدا دەکەن؟ چۆن دەبێت لە تەنیشت هەموو کەسێکەوە دابنیشێت، یان لە دوای یەکێکی ترەوە بڕوات، یاخود گفتوگۆ لە گەڵ کەسێکی تردا بکات. ئەمە لە کاتێکدا ئەوانەی دەیانەوێت پچوکیی خۆیان بسەلمێنن، پێویستیان بە یەکێک بێت کە لە هیچیان نەچێت.
لەبەرئەوە، ئەو کارەکتەرانەی کولتووری نایەکسانیی دەیەوێت

هەبێت لە سەرکردەیەکدا جیاوازە لەوەی کە کولتووری یەکسانیی و شارستانیی دەیەوێت. ئەم دوو داواکارییە جیاوازەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هەدەفی جیاواز. یەکەم هەدەفەکەی ئەوەیە کۆمەڵگایەکی بێ کۆنتراکت دروست بکات، کە تیایدا کەسەکانی بێ مەرج خۆیان بخەنە دەستی دەسەڵاتێکی سەردارەوە. دووەم هەدەفەکەی ئەوەیە کۆمەڵگا لە کۆنتراکتێکدا خۆی ڕێک بخات کە تیایدا مەرج سنوور دانێت بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا. جیاوازیەکی گرنگی ئەم دوو کۆمەڵگایە ئەمەیە: لە کۆمەڵگای بێ کۆنتراکتدا کە کۆمەڵگای نایەکسانییە، هەدەفی حوکم ژێردەستەکردنی جەماوەرەکەیە، بەڵام لە کۆمەڵگای کۆنتراکتدا کە لە سەر خەتی یەکسانی دەڕوات، هەدەفی حوکم بەڕێوەبردنە.

دوو هەدەفی جیاوازی وەکو "ژێردەستەکردن" و "بەڕێوەبردن"، هەمیشە لە شێوەی جیاوازی کارکردن و بەکارهێنانی دەستیاوەکانیاندا خۆیان لە یەکتریی جیا دەکەنەوە. ڕاستی بۆ چووە ئەو کەسەی وتوویەتی: "*شۆڕش چییە، هەر کاتێک چەک و پارە هەبێت دەتوانیت شۆڕش بکەیت*". ئەم بیرە لەو کتێبەدا کە موساد لە سەر جوڵانەوەی چەکداریی (١٩٦١)ی نووسیووە، بە ئاشکرا دیارە. لە کتێبەکەدا ئەوە دەردەکەوێت کە لای سەرکردایەتیی جوڵانەوەکە وەسیلەکە (چەک و پارە) ئەوەندە نزیکە لە هەدەفەکەوە کە ئیتر خۆی هەدەفەکەیە. چەک و پارەت هەبێت، ئۆتۆماتیکیی ئەنجامەکەی ملکەچیی خەڵکە.

تەماشای ئەم دوو نمونەیەی خوارەوە بکە چی پیشان دەدەن:
جارێک، ساڵی ١٩٧٩، کە ئەو کاتە مەنسووری برام پێشمەرگە بوو لە شارباژێڕ، یەکێک لە گوندییەکان وتی: "*ئەرێ بۆ سەرزەنشتێکی شێخ مەنسور ناکەن؟*" من سەرم سوڕما چونکە لەو بڕوایەدا نەبووم کە مەنسور خراپەکار بێت. بۆیە وتم: چی کردووە؟ ئەویش لە وەڵامدا بێ دەسەڵاتیی و بێ هەیبەتیی ئەوی دەربڕی و وتی: "*لەمسەرەوە دێ و لەوسەرەوە تێ دەپەڕێت بەبێ ئەوەی جوارکەس دارکاریی بکات، یان یەکێک لە حەوز مەڵ بکێشێت، فڵانەکەس باشە هەموو ناوچەکە لێی دەترسێت*". پاشان وتی: "*ئەو پیاوە کێیە هەموو سلێمانی بەگیر هێناوە؟*" وتم: مولازم موحسین؟ وتی: "*ئا، ئاوا دەبێت*". مولازم موحسین ئەفسەرێکی پیاوکوژی حکومەتی عێراق بوو لە سلێمانی.

ئەم بۆچوونەی گوندییەکە نەفامیی نەبوو، بە پێچەوانەوە، بەئاگایی بوو لەوەی کە ئەو حاڵەتە کۆمەڵایەتییە چۆن دەگەڕێت. ساڵی (١٩٨١)یش لە گەڵ ژمارەیەک پێشمەرگەدا لە "تاوزەنگ"ەوە هاتمە خوارەوە بچم بۆ شارەزوور. لە ڕێگا ئاوێکمان هاتە ڕێ کە دەبوو بە وڵاخ لێی بپەڕینەوە. **حەمەی تەیب** کە فەرماندەی مەفرەزەکە بوو، موسەقەفانە چووە ناو خەڵکەکەوە بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدەن، بەڵام وەڵام ئەوە بوو کە یەک تاکە وڵاخیان لە دێ دا نییە. دوایی کە چار نەما، بە چاوسورکردنەوە چوو لەو سەرەوە وڵاخ و زەلامی هێناو لە ئاوەکە پەڕینەوە. حەمەی تەیب لەبەر خۆیەوە وتی: "*فڵانەکەس باشتان دەناسێت، وا دیارە بە شەق نەبێت ئیشت ناڕوات*." ئەمە زۆر ڕاستیی پیشان دا، لەوانە: ١- تۆ خۆت هەر کەسێک بیت، ئەو بارە کۆمەڵایەتییەی هەیە بە پێی خۆی یەکێکی ترت لێ درووست دەکات. ٢- کۆمەڵگایەک کە لە بارێکی کۆمەڵایەتیی وادا بێت لەسەر زەبر بڕوات، مانای وایە لەسەر بناغەی بەڕێوەبردن خۆی ڕێک نەخستووە تا گوندێک ماف و ئەرکەکانی خۆی لەناو ئەوەدا بزانێت کە جوڵانەوەیەکی چەکداریی دەیکات.

لە حاڵەتێکدا کە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی لە سەر بناغەی بێمافیی و مافوەرگریی (گەورەو پچوکیی) بێت، بێمافێک ناتوانێت خۆی بخاتە دەستی یەکێکی ترەوە کە دەسەڵاتی هەر وەکو دەسەڵاتی خۆی بێت. ئەوەی مافوەرگریشە ناتوانێت ملکەچیی خەڵکیی بباتەوە ئەگەر نەتوانێت بەسەر دەسەڵاتدارەکانی تردا زاڵ ببێت.

زۆربەی ئەو شەڕ و جیابوونەوانەی کە بۆیاخی هەمە جۆرەی ئایدۆلۆجی و چینایەتیی لێ دەدرێت، لە ناوەڕۆکدا شەڕە بەرانی دەسەڵاتخوازانە بۆ بردنەوەی ملکەچیی جەماوەرەکە.

لە کولتووری گەورەو پچوکییدا، سیاسەت دەسنیشانی ڕەوایی حوکمکردن ناکات، بەڵکو بردنەوەی ملکەچیی جەماوەرەکە بڕیاری لەسەر دەدات. ئەوەی پارتی سوپای عێراق و تورکیا دەهێنێتە سەر کوردستان، لە ناوەڕۆکدا کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە لە لەقبوونی جێگەیاندا لەناو خەڵکدا. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئایا ئەوانەی پارتی دەیان کات تاچ ڕادەیەک نزیکی دەکەنەوە لە هەدەفی تێکشکاندنی هێزەکانی تر. بۆ نموونە، دوای هێنانی ئەو سوپایانە نەک هەزارەها کەس وازی لێ نەهێناون و لاواز نەبوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ژمارەیەکی زۆر چاوەڕێی ئەوە دەکەن کێ لە هەموان بەهێزترە بۆ ئەوەی بچن لە بەردەمی عەرشەکەیدا بوەستن. **عەزیز محەمەد** کە هەموو ژیانی حیزبایەتیی لە کۆمۆنیزمی ناکۆک بە کوردایەتییدا سەرف کردووە، ئێستاش هەڵەی نەکردووە کە بۆ "کوردایەتی" چووە بۆ هەولێر. بڵاوکراوەکانی پارتی دوای ئەو ڕووداوانە نەک مانیان لێ نە گیراوە، بەڵکو ژمارەیەک نووسەر لە ئەورووپاشەوە، کە تەنگوچەڵەمەی ژیانیشیان نیە، لە ڕێگای نووسینەوە خۆیان لە پرۆژەی پارتی بێ بەش ناکەن. مەسەلە هەر ئەوە نییە کە دەسەڵاتدارێکی زۆردار مافی بڕیار دەخاتە دەستی خۆیەوە، بەڵکو ئەوەشە کە کەسەکانیش دەیانەوێت بێمافیی خۆیان تەسلیمی ئەو دەسەڵاتە بکەن و ملکەچیی خۆیان ڕابگەیەنن. ئەمە ڕێکەوت نییە کە چوارمان کۆ ببێتەوەسخوله چەخماخەیەک لە خۆمان دروست دەکەین. لەبەرئەوە، ئاساییە بۆ ئەم کارخانە کولتوورییە کە یەکێک لە دیاردەکانی ئەوە بێت دەسەڵاتدارەکانی چەندەها ماشێنی پڕ چەکدار دوای خۆیان بخەن کە وەزیفەکەیان تەنها سەلماندنی بەهێزیی یەک زەلام و چاوترساندنی ئەوانی تر بێت. یان لە ناو خوێندەوارانیدا، دیاردەی شەهادەی دوکتۆرا، ڕۆحی هۆنراوەو کتێب نووسین بۆ ئەوە بێت کە خاوەنەکەی پیشانی بدات ئەم بێ وێنەیەو لەوانەی تر ناچێت. ئەم دیاردە سەرەتاییانە ئەوەندە خام و هەژارن لە مۆراڵدا، کە زۆر جار تەواو نزیک دەبنەوە لە سرووشتی ئاژەڵیی. مرۆڤ ئەو گەلە ئاژەڵ و چەڵەبانەی دێتەوە بەرچاو کە گۆڵەکانیان بە زمانی نەڕەو چنگ یان کەڵەکانیان بە مرقەو هێزی شاخ و شۆق، زاڵیی و بەهێزیی خۆیان پیشانی ئەوانی تر دەدەن.

## ملکەچیی

ئایا ئەنجامی بێمافیی چییە؟ هەر وەکو چۆن ئاگر حاڵەتی گەرما دەخاتەوە، بێ دەرامەتیی هەژاریی لێ دەکەوێتەوە، ئاواش بێمافیی حاڵەتی ملکەچیی درووست دەکات. واتە ملکەچیی ئەنجامە. دەسەڵاتێک بۆ ئەوەی جەماوەرێک ملکەچ بکات، دەبێت مافیان لێ بسەنێت. بۆ ئەوەی مافیشیان لێ بسەنێت پێویستی بە هێزە. دوو دەسیاوی ماددیی هێزیش لەم جۆرە بارەی لە کوردستاندا هەیە چەک و پارەیە. نموونەی دەسیاوی نامادیش ڕێکخستنە.
ئەی ئایا لە بێمافیی و ملکەچیی چی دروست دەبێت؟

## بەندیی

هەروەکو چۆن بێ دەرامەتیی حاڵەتی هەژاریی دەخاتەوەو کارەکتەری هەژار دەدات بەوەی تێی دەکەوێت، ئاواش بێمافیی ملکەچیی دەخاتەوەو کارەکتەری "بەند" دەدات بە هەڵگرەکەی. بێمافیی و ملکەچیی وەکو هەر دیاردەو بەرهەمێکی سرووشتیی تر، لە سیستێمێکدا فۆرمێک درووست دەکەن. تەماشای گوێز، شوتی، سێو، پرتەقاڵ بکە، هەر یەکە لەمانە بە ڕێکەوت ناوەڕۆک و توێکڵەکانیان درووست نەبووەو یەکێتی ئەو ناوەڕۆک و توێکڵانەش بێ هۆ ئەو شێوانەی وەر نەگرتووە. بێمافیی و سەربەستیی، بۆ

نموونە، ناتوانن لە یەکێتییەکدا فۆرمێک دروست بکەن. بۆ زیاتر ڕونکردنەوەو چەسپبوون تەماشای ئەم چوواندنە بکە:




**بەند، مرۆڤێکی ملکەچی بێمافە**

**وێنەی سیمبۆلیی پێکهاتەی ڕۆحیی مرۆڤی بەند.**

## سەرئەنجام:

هیچ بۆخۆدانەنان و خۆ خستنە دەستەوە، بێمافیی پیشان دەدات. بێمافیی حاڵەتێک بە دەوری خۆیدا دروست دەکات کە ملکەچییە. ملکەچیی و بێمافیی لە یەک سیستێمدا فۆرمێک دروست دەکەن کە بەندییە. هەڵگری بێمافیی مرۆڤێکی ملکەچ و بەندە. ئایا دەزانیت ئێستا گەیشتوینەتە کوێ؟
لێرەدا لەوێداین کە (س) بەندییە. کەواتە تەواوی پرسیارو وەڵامەکە ئەمەیە:
بۆ لایەنی خەڵکەکە تەواوکەری ئەوەیە کە سەرکردەی هێزەکان بڕیاری لەسەر دەدەن؟ وەڵام: چونکە خەڵکەکە "بەندە". کەواتە، بەندیی بەرپرسیارە لەوەی کە لایەنی خەڵکەکە تەواوکەری ئەوەیە کە سەرهێزەکان بڕیاری لەسەر دەدن.
کاتێک: **دەسەڵاتدارەکان** بڵاوە بە جوڵانەوەکان دەکەن، بە کۆمەڵ دەچنە لای سەددام حوسەین، سامانی کوردستان تاڵان دەکەن، یەکێتی خاکی عێراق دەپارێزن، لەگەڵ ئەنفالچیەکاندا یەک دەگرنەوە، سوپای داگیرکەران دەهێننە سەر کوردستان، دەکەونە پارە دزین و خراپەکاریی، **خەڵک** "ماف" ی نییە بڕیارێکی تری پێ بدات، بەڵام "بێمافیی" هەیە پێی ملکەچ بێت.
بۆیە؛ جوڵانەوەی کورد لە ڕوکەشدا بە هەر فکرێک ڕەنگاوڕەنگ بکرێت، لە بنەڕەتدا پەیوەندی بە زانیاریی و تێگەشتنەوە نییە. کەس ئەوەندە بێ مێشک نییە وابزانێت نموونەی ئەوانەی کە لە سەرەوە باسم کرد سوودی هەیە بۆ میللەتی کوردو مرۆڤی کورد. کێشەکە لە ناوەڕۆکدا پەیوەندی بە جەوهەرە کولتوورییەکەوە هەیە، ئەوە کە بەرپرسیارە لە هەڵوێست و کردارەکان. ئاستێک هەرچەندە ڕەسمی تەختەی لەسەر بکرێت و هەموو کەسێکیش بە تەختەی بێتە بەرچاو، بەڵام کە خستە ناو ئاوەوە جەوهەرەکەی بڕیاری نوقومبوونی دەدات، نەخشەکەی و چاوەڕوانیی تەماشاکەرەکان ناتوانن سەرئاوی بخەن. هەرچەندە بەدەم و بەنووسین قسە زۆرە لەسەر ڕزگاریی و سەربەستیی و هەژاران، بەڵام کردارەکان، کە جەوهەرە کولتوورییەکە لێیان بەرپرسیارە، تەواو باسی شتێکی تر دەکەن. بەندەپیاوێک کاری بەوە نییە دەسەڵاتدارەکەی چی بەسەر کورد دەهێنێت، ئەو بەهەڵی دەزانێت کە زیاتر پچوکیی خۆی بسەلمێنێت. جەوهەرە کولتوورییەکە، کە پێکهاتەکەیم پێشتر دەسنیشان کرد: (بێمافیی - ملکەچیی)، ئەو کارەکتەرە نادات بە مرۆڤی کورد کە قسەی هەبێت لە ڕووداو و کێشەکاندا. بۆیە دەسەڵاتدارەکان هەرچییەک بکەن هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. خەڵکی کورد کە نەیتوانیوە وەرچەرخانێک بەرامبەر بەم دژوارییە دروست بکات، لە بەر ئەوە نییە کە هێشتا بارەکە تیایدا ماوە. با هەر کەس لەخۆی بپرسێت: چ خراپەیەک ماوە نەکرابێت؟ چاوەڕێی چی تر دەکەن ئەگەر دەسەڵاتدارەکان کردیان تۆ دەڵێیت ئیتر بەس؟
جەوهەرە کولتوورییەکە (بێمافیی و ملکەچیی) ئەو کارەکتەرە دەدات بە مرۆڤی کورد، کە بە بێ لێکدانەوەو مەرج، بەند بێت بە هەموو بڕیارێکەوە کە سەرکردەی حیزبەکانی دەیدەن، بەند.

### سەرچاوەکان:


١- الحزب الديمقراطى الكردستانى، اللجنه التحضيريه، تقييم مسيره الثوره الكرديه وانهيارها والدروس والعبر المستخلصه منها. (بە ناميلكەكەی د. مەحمود ناسراوە.)

٢- هەژار، بە یادی تۆ دەژی دڵم، کۆمەڵەی فەرهەنگیی سویدکوردستان، ستۆکهۆڵم-١٩٩٢

٣- نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ١٩٩٧.

٤- لە مانگی (٩)ی ئەمساڵدا تەلەفیزۆنی میدیا تێڤیی پیشانی دا.

٥- ن. حەفید، کۆنتراکت ژ:٢، ل: ٣٥.


---

## ئەی سووتەمەنی و قوربانیی مێژووەکە دەڵێت چی؟

ژمارەیەکی زۆر ژیانی لە پێشمەرگایەتییدا سەرف کردووە. جولانەوە چەکدارییەکان لەسەر خۆیان و کەسوکاریان کەوتووە. هەندێک لەمانە ئێستا گەشتونەتە دەرەوەی وڵات. بەڵام مەرج نییە ئێستایان توانیبێتی لە چنگ ڕابووردویان دەرباز ببێت. هەر یەکەو کۆمەڵێک ناسۆرو بیرەوەریی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، کەم و زۆر ژیانی ئەمڕۆشیان نائاسایی دەبێت.
ئەمانە خۆیان لەناو ڕووداوەکاندا بوون، کەچی ئەوەی دەنگی دەبیسترێت بەزۆریی هەر نووسەرە، یان ئەوانەن کە بڕیاریان داوە. ئەی ئەوەی سووتەمەنی و قوربانیی مێژووەکەیە دەڵێت چی و چۆن کێشەکانی دێتە بەرچاو؟ دەرفەت ڕێکخستن بۆ قسەی ئەمانە گەلێک گرنگیی هەیە، لەوانە گرنگیی مێژوویی.
کۆنتراکت بە ئەرکی خۆی دەزانێت کە دەرگای ئەم باسە بە پرسیارنامەیەک بۆ ئەو کەسانە بکاتەوە، کە کولتووری نایەکسانی مافی ڕاو بڕیاری دانەناوە بۆ ئەوان هەیان بێت.

**وەڵام: ژمارەی داهاتوو**

**کۆنتراکت**

### ئاشبەتاڵ؛

**ساڵی ١٩٧٥ ئاشبەتاڵی جوڵانەوەی چەکداریی ڕووی دا. بیست و یەک ساڵ دوای ئەوە، یەکێتی نیشتیمانی، کە عەشایەریش نەبوو، سەرکردەکەشی مێژوونوس، خوێنەوار، شارنشین بوو، هەمان حاڵەتی لە ساڵی (١٩٩٦)دا بەسەرهاتەوە.**

**پرسیار: ئاشبەتاڵ چییە؟ بۆ ڕوو دەدات؟ چۆن ڕوو دەدات؟ چۆن دەردەکەوێت؟**
**وەڵام: ژمارەی داهاتوو.**

# یاساکانی توانای میللەت بۆ لابردنی رژێمێک

نووسینی : (امیر طاهـــري)
لەرۆژنامـــەی(الشـــرق الاوســـط)ی رۆژی 1998/5/23 بلاوکراوەتەوە.
وەرگێڕانی: کەمال جەمال موختار

یاساکانی توانای میللەت: لێرەدا مەبەست لەو هەلومەرجە تایبەتییانەیە کە رژێم و دەسەلاتێکی سیاسیی پێ لادەبرێت. هەرچەندە ئەو هەلومەرجانە لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر دەگۆڕرێت، بەلام سەرجەم هەمویان یەک بۆچوون و پەیرەوییان هەیە، ئەویش یاسای توانای میللەتە لە هەولدان بۆلابردنی ئەو رژێمە.{وەرگێر}

**شێوەی لابردنی رژێم تا رادەیەکی زۆر بەستراوە بەو کات و شوێنەوە، کە ئەو رژێمە دەستەلاتدارانەی تیا دان.**

**تا سەرەتای ئەم سەدەیەش، لابردنی رژێمێک یان لە رێگای داگیرکردنی هێزێکی دەرەوە یاخود لە ئەنجامی ناکۆکی نێوان دامودەستگاکانیەوە روویان دەدا. بەدەگمەنیش لە رێگای شۆڕشێکەوە رژێمێک لابراوە، وەک ئەوەی ئینگلستان، کاتێک کرۆمۆێل دەستی بەسەر حوکمدا گرت {1}، یان وەک ئەو شۆڕشەی کە لە فەڕەنسا بەرپابوو.**

لە ناوەڕاستی چەرخی بیستەمدا، یەکێک لە باوترین رێگا بۆ لابردنی رژێمێک، کودەتای سەربازی بوو. لە نێوان سالانی (**1945 –1975**)دا زیاتر لە **218** کودەتای سەربازیی لە **71** ولاتدا روویاندا. تەنانەت بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێت کودەتای سەربازی بکەن، (ئەدوارد لۆتواک)ی پسپۆڕی ئەمەریکی کتێبێکی دەربارەی چۆنێتی کودەتاکردن نووسی.

بە لای کەمەوە لە 30 ولاتیشدا، حکومەت لە رێگای هەلبژاردنەوە تیایاندا گۆڕدران، هەرچەندە ئەو گۆڕانکارییانە هەموو لایەنەکانی رژێمە سیاسییەکەی نەگرتەوە. بەدەگمەنیش رووی داوە، رژێمێک لە رێگای شەڕی پارتیزانی و شەڕی ناوخۆوە بێتە گۆڕین. هەرچەندە ئەو بیروباوەڕانە کاریان کردبووە سەر زۆربەی دەستە توندڕەوەکان، بۆ ئەوەی حوکم بگرنە دەست. لە ئەمەریکای لاتیندا چەندەها سال شەڕی پارتیزانی کرا، بەلام نەیان توانی بۆ نموونە تاکە رژێمێکی سیاسی بگۆڕن.

لە هەفتاکان بەرەو دواش، وردە وردە شێوەیەکی نوێ بۆ لابردنی رژێم هاتە گۆڕێوە. یەکێک لەوانە ئەوەی یۆنان(گرێکلاند)ە، کە خۆپیشاندان و مانگرتن لەکار و کاری جەماوەرییانەی تر بوونە هۆی رووخاندنی رژێمی سەربازیی ولاتەکە، کە ئەو رژێمە خۆشی لە رێگای کودەتایەکی سەربازییەوە دەستەلاتی گرتبووە دەست.

حالەتی دووەمیان ئەو رووداوەی ئێران بوو، کە بەڕاپەڕینێکی جەماوەریانە و بەپێشەنگی کۆمەلێک لە زانا شیعەکان ، توانییان کۆتایی بە رژێمی شای ئێران بهێنن.

## دەستەلاتی میللەت

دوای ئەمەش لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە، هەمان شێوە لە گەلێک ولاتانی تردا بۆ لابردنی رژێمەکانی خۆیان، بەکار هێنراون، لەمانە کۆریای باشوور و بەڕازیل، تەنانەت ولاتە کۆمۆنیستەکانی پێشووش.

ئەم شێوەی لابردنی رژێمە بەستراوە بەو شتەوە کە پێی دەگوترێت " دەستەلاتی میللەت".

ئەم رێگایە وەک بەتاقیکردنەوەکانی چین و بورمادا دەری دەرخست، هەمیشە سەرکەوتوو نییە. خۆ ئەگەر بێتو سەرکەوتنیش بەدەست بهێنێت، گومان لەوەدا ناهێلێتەوە کەدەبێتە مایەی گۆڕانکارییەکی سیاسیی مەزن.

لەوەش دەچێت کە شێوازی کودەتای سەربازیی بۆ لابردنی رژێمێک وەک جاران ئەوەندە رەواجی نەمابێت و لەکار کەوتبێت. لە سالی هەشتاکاندا کۆمەلێک کودەتای سەربازی سەرکەوتوو لە گامبیاو نیجیریا و سودان

روویاندا، بەلام ئەو رژێمانەی بەم کودەتایانە دروست بوون، لەلایەن زۆربەی ولاتانەوە دانیان پیا نەنران وبروایان پێ نەکرا.

لە هەندێک حالەتی دیکەدا، دوواترینیان ئەوەی لە سیرالیۆن رووی دا، دەستەلاتی ئەو رژێمەی کە خۆشی بە رێگای کودەتای سوپایی هاتبووە سەر حوکم، توانرابە بەرگری میللیی و هێزی دەرەوەی ولات رژێمەکە لابەن.

## مەرجەکانی دەستەلاتی میللەت

بۆ ئەوەی شێوازی ''دەستەلاتی میللەت'' بۆ نەهێشتن و لابردنی رژێمێک کاریگەر بێت، پێویستە ئەم کۆمەڵە مەرجانە هەبن :

**مەرجی یەکەم : نەمانی رەوای سیاسیی ئەو رژێمە.**
لە هەندێک ولاتدا بوونی ئەو رەوا سیاسییە بە رادەیەکی زۆر بەستراوە بە بوونی رژێمەکە خۆیەوە. واتە خەڵکەکە گوێ نادەنێ و بەبوونی ئەو رژێمە قایل دەبن، ئەمیش لەبەر ئەوەی رژێمەکە خۆی لە راستیدا هەیە. بەلام رەوای سیاسیی ئەو جۆرە رژێمانە زۆر ناجێگیرە، چونکە زۆر هۆی جیاواز هەن دەبنە مایەی ئەوەی رژێمەکە رەوا سیاسییەکەی خۆی لە دەست بدات. لەوانە سەرنەکەوتنی رژێم لە سیاسەتی دەرەوەدا، یان گیروگرفتێکی سەختی ئابووریی. یان رەنگە سامناکترینی ئەو هۆیانەش ئەوە بن کە رژێمەکە خەریکی فەساد بێت، وەک هەندێک پێیان وایە. ئەم دیاردەیە هەرچەند ئەوەندە بەربلاویش نەبێت. بەلام شتی رووکەش لە سیاسەتدا، بایەخی زۆرتر پێدەدرێت وەک لە راستیی. هەروەها کاری سەرکوتکردن(قمع)، بەتایبەتی بەخوێنرشتن و کوشتارێکی زۆر، دەبنە هۆی نەمانی رەوای سیاسیی رژێمێک.

**مەرجی دووەم** : بۆ لابردنی رژێمێک دەبێت بەلای کەمەوە بەشێک لە دەستگا سەرکوتکەرەوەکە وەک (سوپا، پۆلیس، پۆلیسی نهێنی، هێزی ئاسایش) متمانەی بەو رژێمە نەمێنێت و ئیدی کاری بۆنەکات.

لە کاتژمێری هەشتی سەر لە بەیانی 1978/2/11، سوپای شای ئێران بێلایەنی خۆی راگەیاند و لە کاتژمێری یانزەی نیوەڕۆی هەمان رۆژدا رژێمی شا رووخا. دوا سەرۆک وەزیرانی رژێمەکە لە ترساندا بە سەروسمێڵێکی دروستکراوەوە خۆی شاردبووەوە.

هەروەها رژێمی چاوسیسکۆی رۆمانیاش بەوە کۆتایی هات کە جەماوەر وتارەکەی چاوسیسکۆیان بە هاواری : (ئازادی ... ئازادی) پێ بڕی، ئەمەش لە کاتێکدا کە ملیۆنەها بە تەلەفیزۆن گوێیان لە وتارەکە دەگرت. ئەو کاتەی کە هێزەکانی ئاسایش رازی نەبوون خەڵکی دەمکوت بکەن، ئەمە بووە هۆی ئەوەی لە ماوەی (24) سەعاتدا رژێمەکە روخا.

بەلام ئەو رژێمانەی کە دەتوانن پارێزگاری لە مانەوەی هێزە سەرکوتکەرەوەکەیان بکەن، وەک ئەوەی سەدام حوسێن لە عێراقدا، هەلێکی باشتریان لەبەردەستدا دەبێت بۆ مانەوەی خۆیان.

لەگەڵ ئەمانەشدانانوانرێت، تەنیا بەنەمانی رەوایی سیاسیی و، لە دەستدانی هێزی سەرکوتکردن، رژێمێک بروخێنرێت، بەلکو گرنگ لەوەدایە کە لە هەمان کاتدا دەستەلاتێکی سیاسیی و مورالیی هەبێت، کەتەریب لە پێشبرکێدا بێت لەگەڵ ئەو رژێمە دەستەلاتدارەدا، کە مافی هەڵبژاردنی هاوولاتییەکان زامن بکات.

لە پۆلۆنیا بزوتنەوەی یەکێتی کرێکاران، ناسراو بە(سۆلیداریتی) لە ساڵی (1980)وە بووە دەستەلاتێکی هاوتای رژێم. لە ئێرانیشدا دامودەستگا شیعە ئاینییەکان دژی شا، هەمان دەوریان بینی. لە بورماش تا ماوەیەک بزوتنەوەی قوتابیان توانی ببێتە دەستەلاتێکی هاوتای رژێم.

هەروەها سەرزکە میللییە دوورخراوەکان، کۆمەڵە ئۆپۆزیسونە نهێنییەکان، مزگەوت و کەنیسە جیابووەکان، لەگەڵ دەستبەسەر و بەندکراوەکانیش دەتوانن هەمان رۆڵ بۆ دروستکردنی ئەو جۆرە دەستەلاتە هاوتایانە ببینن.

نێلسۆن ماندێلا لە ماوەی (23) ساڵی بەندکردنیدا، ئەو رۆڵەی بینی، ئەمرۆش مەسعود ئابیولای سەرۆکی بەندکراوی نێجیریا {2} هەمان رۆڵ دەبینێ.

لە کۆتاییدا لابردنی رژێمێک پێویستی بە شێوە سەرکردایەتییەکی بەدیل هەیە، هەر چەندە ئەو سەرکردایەتییە نوێیە پێگیشتووش نەبێت، چونکە کۆمەڵیش وەک سروشت، هەرگیز بەوە قایل نابێت لە شتێک دەستبەردار بێت تا نەزانێت چی جێگای دەگرێتەوە.

زۆر لە بزووتنەوەی شۆرشگێریانە کە لە گۆرینی رژێمدا سەرکەوتوو نەبوون، لە راستیدا لە بەر ئەوە بووە کە نەیان توانیبوە ئەڵتەرناتیف (بەدیل)ێکی باوەڕپێکراو بخەنە بەردەم جەماوەر. ئەم ئەڵتەرناتیفەش پێویست بووە جێی رەزامەندی لایەنە جیاوازەکانی کۆمەڵگا و ئەو هێزە بێگانانە بێت کە بەرژەوەندییان لەو ولاتەدا هەبوو.

جارێکی دیکەش، عێراق وەک نمونەیەکی گرنگ دەتوانین بهێنینەوە، بەوەی تا ئیستا لە هێنانی ئەڵتەرناتیفێکی

شیاو و گونجاودا سەرکەوتن بە دەست نەهاتووە، کە خواستی زوربەی چینەکانی کۆمەلگای عیراقی بهێنێتە دی، لە هەمان کاتیشدا بەرژەوەندی ئەو هێزانەش (ولاتانەش ) مسۆگەر بکات. ئەمە یارمەتی ئەوەی داوە کە رژێمەکە تا ئیستا لە جێی خۆی ماوەتەوە. هەرچەندە رژێمەکە رەوا سیاسییەکەی خۆی دەمێکە لە دەست داوە.

**(نووسەری وتارەکە ئیتر دێتە سەر باسی رووداوەکەی ئەندەنووسیا کە تا ئەو کاتە رژێمی سوهارتۆ هەر دەستەلاتی بە دەستەوە مابوو. لە بەر رۆشنایی ئەو باسەی سەرەوەدا ئەوە رادەگەیەنێت کە ئەم رژێمەش وەک هەموو رژێمەکانی دیکە رەوای سیاسیی خۆی لە دەست داوە و هێزە سەرکوتکەرەوەکەشی لە دەست چووە. لە بەرامبەریشەوە خەریکە هێندی هێندی ئەو دەستەلاتە سیاسییەش پێک بێت کە لە کاتی نەمانی رژێمەکەی سوهارتۆدا ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە. ئەو گۆڕانکارییانەی لە ئەندەنوسیاش لە دواییدا روویان دا کە تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامن، راستیی بۆچوونەکانی نووسەر دەسەلێنن.) {وەرگێڕ}**

{1}<u>ئۆلیڤەر کرۆمۆیل Oliver Cromwell(1599-1658):</u>
یەکێک بوو لە لایەنگرەکانی رژێمی کۆماریی و نەهێشتنی رژێمی پادشایەتی لە ئینگلستاندا. گیانی شۆرشگێرێتی دژی رژێمی پادشایی لە ناو خەلکدا بلاوکردەوە. دژی سوپای شارلسی یەکەم جەنگا و بەسەریا سەرکەوت. شارلسی لەسێدارە دا و حوکمی ولاتی گرتە دەست. بەلام بەشێوەیەکی دیکتاتوریانە فەرمانڕەوایی ولاتەکەی کرد. پەرلەمانی ئینگلیزی لابرد. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمدا ئێرلەندە کەوتە ژێردەستی ئینگلستانەوە.

{2} رژێمی نایجیری لەبەر فشاری جیهانیی و ناوەوەی ولات، مەسعود ئابیولای ئازاد کرد. ئابیولا لە دەرەوە مرد و مردنەکەشی گەلێک پرسیاری لە دوای خۆی جێهێشت. {وەرگێڕ}.

## ئەم خالانە زۆر گرنگن

بلاوکردنەوەی زانیاریی لە سەر بزووتنەوەی باکووری کوردستان، رەخنەی بە کەلک لەو شۆڕشە، بۆ ئەوەی ئەویش بە دەردی باشوور و رۆژهەلات نەچێت.

( خۆێنە رێک )

نابێت گۆڤارەکەتان بە هیچ شێوەیەک پاشگەزی بکات، یاخود بترسێت لە بلاوکردنەوەی رووداوەکانی کوردستان. دەبێت بە راشکاوی هەموو شتێک بە بەلگەوە لەسەر هەموو پارتێک، یاخود کەسێک کە کردەوەی هەلەیە و زیان دەگەیەنێتە نەتەوەکەمان، بلاوبکاتەوە. ( خۆێنە رێک )



## ئەگەر خۆشتر بنووسرێن

هیچ گوێ مەدەنە وتەی نەزان، چونکە ئەو نەزانانە دێنە سەر رێگای راستی گۆڤارەکەتان. وتاری چاکی تێدایە، بەلام کەمێک بە زمانی فەلسەفی نووسراوە. خۆ چاکە، بەلام ئەگەر خۆشتر بنووسرێت باشتر خوێنەران لێی تێدەگەن.

( خۆێنە رێک )

گۆڤارێکی حەساسە و دەنگێکی زیندووە، کلیلی کردنەوەی هەست و بیری ئەو مرۆڤانەیە کە لەرۆژگارە سەختەکاندا بەشدار بوون و ئیستا وەک سنووقی هەشتەرخان خۆی قوفل داوە، خوا خوایەتی کەس لێی نەدات و نەیکاتەوە. بەلام هەندێک بابەتی وەک زەنگی کلێسا خورپە بە دل دەدات. ( خۆێنە رێک )

## بە یادتان نەچێت

هیوادارم وەک چۆن رەخنەی راست لە پارتەکانی وەک (ی.ن.ک) و (پ.د.ک) و (ح.د.ک.ا) دەگرن، ئاواش حیزبە سیاسییەکانی تری کوردستان، وەک (پ.ک.ک) و هێزە ئیسلامییەکانی کوردستانی باشوور، لە یاد نەکەن.

( خۆێنە رێک )

## وا نەبێت وا بێت

گۆڤارەکەتان کاتی خۆیەتی و جێگای بابەتەکان لە شوێنی خۆیاندان. بەو هیوایەی جێگای جنێودان لە گۆڤارەکەتاندا کەم ببێتەوە.

( خۆێنە رێک )

زۆر لە رۆشنبیر و نووسەرەکان، بە پارە و مامە حەمەیی لاواز دەبن. تکایە با کۆنتراکت هەر بوێر و راست بێت.

( خۆێنە رێک )

# بۆ شیرین !

تۆ لە مانگی رەشی حوزەیرانی(1963) دا لە دایک بوویت و کەچی ناویان نایت شیرین!
لەو رۆژەدا تۆی تێدا لە دایک بووی شیرینیی قاتی بوو، کەچی هەر ناویان نایت شیرین!
لەو رۆژەدا شیرینیی چ لە رووی خەلکیدا و چ لە رووی سروشتدا ئەوەندەی تۆزقالێکیش بەدی نەدەکرا، کەچی هەر ناویان نایت شیرین!
دەبێت دایکت...دایکم، لەو رۆژەدا شیرینیی لە چیدا بەدی کردبێت کەوا سوور بوو لەسەر ئەوەی ناوت بنێت شیرین!؟
کە تۆ منالێکی ساوا بوویت، من لە تۆ گەورەتر بووم ، بۆیە بەیەکتر نامۆ بووین!
کە تۆ سەرپێ کەوتیت و کەوتیتە کۆلان بۆ یاری، من ئەوسا لە تام وخۆشیی کۆلانان بووبوومەوەو کەوتبوومە سەر شەقامان و شاگردیی، دیسان هەر بەیەکتر غەریب بووین و یەکترمان هەر نەناسی.
من کوڕ! تۆش کچ! لە کۆمەلگای ئێمەدا کچ و کوڕ با خوشک و براش بن، هەر نامۆن بە یەکتر.
رۆژگار هات و گەردوون گەڕا، منی هەلدایە ئەم لاو تۆش بۆ ئەو لا! من لێرە لە سوید و تۆ لەوێ لە هەلەبجە! من غەریبی ئەم ولاتەو تۆ غەریبی ولاتی خۆت!
پاش دەیان سال ولەیەکتری پچڕان و دوور کەوتنەوە، بە هەگبەیەک بیرو ئەندیشەی تازەوە گەڕامەوە. بەو نیازە گەڕامەوە وتم ئەم جارەیان هەول دەدەم هێندە بۆت نامۆ نەبم، گوێ بۆ راز و نیازی دلت شل دەکەم. هەول ئەدەم تێت بگەم و تێم بگەیت، کەمێک هەوری غەریبیمان بڕەوێنمەوە.
کەچی نەکرا بە یەکدی شاد بینەوە. تۆ هەر جێ نزارێکیشت نەبوو تا بێم و تێر تێر بۆ غەریبیمان بگریم.
تۆ پێشتر، پێش ئەوەی هەوری زەردی کیمیابارانەکەی هەلەبجە شەهیدت بکات، سارد بوو بوویتەوە. تۆ کاتێک شیرت بە منالە ساواکەت ئەدا، پارچە تۆپێک هاتبوو لە کەللەتدا گیرسابۆوە و دلی وەستاندبوویت. منالە ساواکەشت ئەیان ووت هێشا مەمکە ساردو سڕەکەتی بەرنەدا بوو، بێهودە هەر خەریکی مژینی بوو!
تۆ سارد و شاریش سڕ ، ولاتەکەم سارد و ژیانیش سڕ، منیش سارد و سڕ و خوشک و برایەتیشمان هەر سارد وسڕ. داخەکەم رۆژگاریش رێی پێنەدام کەمێک گەرمایی بە خوشک و برایەتییەکەمان بگەیەنم، بۆیە دەلێم شیرین گیان !لێم ببوورە !

حسێن موستەفا 1998/6/15

# بە ئازارەوە سەر دەنێمەوە

من لە سالی( 1985 )ەوە لە سوید نیشتەجێ بووم. دایکم و برایەکم لە هەلەبجەدا کوژران، بە ئاواتی ئەوەوە بووم جارێکی تر بیان بینمەوە.
سالی 1991، پاش راپەڕینەکە، کە گەڕامەوە تەنانەت گۆڕەکەشیانم نەدۆزییەوە بۆ ئەوەی بچمە سەر مەزاری دایکم. بەوەش رازی و دلخۆش دەبووم ئەگەر گۆڕەکەیم بدۆزیبایەوە. پرسیارم کرد، وتیان بەکۆمەل نێژراون! وتم باشە نازانن لە چ کۆمەلەگۆڕێکدا نێژراون؟ وتیان نەخێر! لەبیرمان نییە، چونکە کاتێکی نائاسایی بوو، بە پەلە ژێر خاک کران.
زۆر بیریان لێدەکەمەوە، هەست دەکەم کە نەم توانییوە و بۆم نەکراوە پاداشتێکی دایکم بدەمەوە و دل و ویژدانم رازی بکەم بەوەی تەنیا گولێک لە سەر گۆڕەکەی دابنێم و تێر باوەش بە گۆڕەکەیدا بکەم و بگریم، یاخو درەختێک لە تەنیشتییەوە بنێژم.
تا ئەو رۆژەی منیش دەمرم بە ئازارەوە سەر دەنێمەوە و خەم و خەفەت دەچێژم، نەک تەنیا بۆ ئەوان بەلکو بۆ کارەسات و روداوەکەش، کە هەمیشە لەبە، حاەمەو ساتێک لێم ون نابێت.

کەمال مەلا خدر خەرامان

مانگی 3/ 1998



# وەڵامی خوێنەران

"کۆنتراکت" سەرنج و رەخنە و پێشنیاری خوێنەرانی بەلاوە گرنگە، بۆیە زۆر سوپاسی ئەو خوێنەرانە دەکەین کە پێشنیار و سەرنجەکانی خۆیانیان دەربارەی "کۆنتراکت" بۆ ناردووین. سوپاسی تایبەتی ئەو خوێنەرانەش دەکەین کە پشتگیریی خۆیان بەرامبەر گۆڤارەکە دەربڕیوە و گۆڤارەکەیان بە کەسانی دیکە ناساندووە. هیچ نامەیەک پشتگوێ ناخەین و لەو سەرنج و پێشنیار و رەخنانە دەکۆڵینەوە کە بۆمان دەنێردرێن. ئەو سەرنج و پێشنیارو رەخنانەی کە لە چوارچێوەی کاری "کۆنتراکت" دا جێگایان ببێتەوە لەبەرچاویان دەگرین و وەڵامی ئەو رەخنانەش دەدەینەوە کە بابەتیانە مەسەلەکان هەڵناسەنگێنن. لێرەدا ناتوانین یەکبەیەک وەڵامی نامەکان بدەینەوە بەڵکو هەوڵدەدەین لەو خاڵانە بدوێین کە لە زۆر نامەدا دووبارەبونەتەوە. یەکێک لەو خاڵانەی کە لە زووربەی نامەکاندا دووبارە بۆتەوە پەیوەندی بە زمانی نووسینی گۆڤارەکەوە هەیە. پێشەکی زۆرمان پێ خۆشە کە خوێنەری کورد ئەوەندە بەتەنگ زمانی کوردییەوەیە و زمانی نووسینی گۆڤارەکەمان بۆ پوخت دەکات (بڕوانە ئەو چەند پەرەگرافەی خوارەوە). بەلام، چاکتر وایە کە سەرچاوەی ئەو سەرنج و رەخنانە مەزاج نەبێت بەڵکو لەسەر بناغەیەکی زانستیی بێت و خوێنەران بەڵگەیان هەبێت بۆ ئەو شتانەی کە دەینووسن. بە پێویستی دەزانین کە هێندێک لایەنی زمانی نووسینی "کۆنتراکت" روون بکەینەوە. بۆ ئەو مەبەستە بەشێکی نامەیەکی خوشکێکی خوێنەر، بێ دەستکاریی، بڵاودەکەینەوە.

## هیچ نامەیەک پشتگوێ ناخەین

ئەو خوێنەرە لەنامەکەیدا نووسیویەتی: "زۆر بەختیار دەبم ئەگەر لە کاتی نووسینەوەدا بتوانن بەشێوەیەکی باشتر کۆنترۆڵی یاسای خاڵ و خاڵبەندی بکەن و هەروەها هێندێک وشەی ناخۆشی بەراستی وشەی سەرزاری فاشییەکان و جاشەخۆماڵییەکانی ئێمەن، وەک وشەی (لوغم) کە بەراستی چەند تەقینەوەی دەمترسێنێ هێندەش ئەو ناوە (وشەیەکە ناخوێندرێتەوە) دزێوە و رەشە......" چەند باشتر دەبوو ئەگەر ئەو خوشکە خۆی هەر هیچ نەبێت لە نامەکەی خۆیدا نموونەیەکی سەرکەوتووی خاڵبەندی پیشان بدایە. ئەو خوێنەرە پێشنیاری ئەوەی کردووە کە لەبری (لوغم) دەبوایە وشەی (مین)مان بەکاربهێنایە و دەنووسێت: "ئێستا خەڵکی کوردستان و دەرەوەش وشەی (مین) بەکاردەهێنن، وەک لە (لوغم) من مەبەستم ئەوەیە کە با کۆنتراکت، خوێنەر فێری ئەوە بکات کە بە زاراوەی شیرینی کوردی و وشەی کوردی کۆنتراکتی خۆی بنووسێتەوە"
بۆ ئەم خوشکە خوێنەرە و هەموو ئەو خوێنەرانەی دیکە کە سەرنجیان دەربارەی خاڵ و خاڵبەندی لە نووسینەکانی "کۆنتراکت"دا دەربڕیوە دەڵێین: سوپاس بۆ سەرنجەکانتان. هەوڵ دەدەین کە ئەم لایەنەی وتارەکان باشتر بکەین. داواشتان لێدەکەین کە ئەگەر دەتوانن ئەو وتارانەمان بۆ بنێرن کە دەربارەی خاڵ و خاڵبەندی لەزمانی کوردیدا نووسراون بۆ ئەوەی سوودیان لێ ببینین. پێش ناردنیان بۆ ئێمە، تکایە خۆشتان چاوێک بەو وتارانەدا بخشێنن بۆ ئەوەی لە نامەکانتاندا خاڵ و خاڵبەندی رەچاو بکەن و نامەکانتان وەک ئەو نامەیەی سەرەوە و نەبن.

کاتێکیش رەخنە لە لایەنێکی زمانەوانی "کۆنتراکت" دەگرن، تکایە بەلایەنی کەمەوە چەند نمونەیەک بهێننەوە بۆ روونکردنەوەی رەخنەکانتان.

## "مین" لە دژواریی "لوغم" کەم ناکاتەوە

دەربارەی وشەکانی (لوغم) و (مین)یش بەو خوێنەرە دەڵێین: ئەو دوو وشەیە، وەکو گەلێک وشەی دیکە (موشەک (ساررووخ)، هاوەن (خومپارە)، ناپاڵم، .. هتد) وشەی بێگانەن و هیچیان "زاراوەی شیرینی کوردی" نین. لە کوردستانی باشوور و رۆژئاوادا وشەی (لوغم)، کە لە عەرەبییەوە وەرگیراوە، بەکاردەهێنرێت و لە بەشەکانی دیکەدا وشەی (مین)، کە لەزمانی فارسی و تورکییەوە وەرگیراوە، بەکاردەهێندرێت. ئەگەر وشەی (لوغم) بە عەرەبی وەسفی ئەو بەرهەمە دەکات کە لە لایەن رژێمێکی عەرەبییەوە بەکاردەهێنرێت بۆ کاولکردنی کوردستان، ئەوا وشەی (مین) ناوە لاتینییەکەی هەمان بەرهەمە کە لە وڵاتانی دیکەدا دروست دەکرێت و عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا و گەلێک وڵاتانی دیکە دەیکڕن و لە کوردستاندا یان لەجێگای دیکەدا دەیان چێنن. جا ئەگەر ئەو بەرهەمەی کە قاچی یەکێک دەبەڕێنێت (لوغم)ی پێ بگووترێت یان (مین)، کە هەریەکەیان بەشێک لە کورد تێی دەگەن، ئەوا هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت. کاتێک (لوغم)ێک دەتەقێتەوە یەکێک دەکوژێت یان بریندار دەکات. ئیتر وەنەبێت کە ئەگەر (لوغم) قاچ ببەڕێنێت ئەوا (مین) یان ناوێکی کوردی بۆ ئەم بەرهەمە دزێوە قاچ بدات بە خەڵک و گوڵڕێژیان بکات. ئەگەر (لوغم) وشەی سەرزاری فاشیەکان و جاشەخۆماڵییەکانی کوردستانی باشوور بێت، ئەوا پاسدار و جاشە خۆماڵییەکانی کوردستانی رۆژهەڵات وشەی (مین) بەکاردەهێنن. ئەگەر کورد هەموو ئەو وشانە لەخۆی قەدەغە بکات کە دوژمنەکانی بەکاریان دەهێنن، ئەوا دەبێت دەمی خۆی بدوورێت.
خوێنەرێکی دیکە کۆمەڵێک "ئامۆژگاریی" بۆ ناردووین دەربارەی زمانی کوردی. لێرەدا، بێ دەستکاریی رێنووسی نامەکە، تەنیا یەکێک لە ئامۆژگارییەکانی بڵاودەکەینەوە و سەرنجی خۆمانی لەسەر دەدەین. ئەو خوێنەرە نووسیوێتی: "بۆچی دەنووسن یابان، ژاپۆن باشترە و وشەکە JAPONە. ئەگەر میللەتی عەرەب بەگشتی پیتەکانی چ و پ یان نییە خۆ میللەتی کورد ئەم پیتانە هەیە. بەداخەوە لە عیراق و تەنانەت لە کوردستانیش بە هەر کەسێکی غەیرە کورد و عەرەب دەڵێن یابانی، بیانی و لەم جۆرە شتانە. ئەمە هەڵەیە. تەنانەت بە خەڵکی تایلەند و ڤیتنام و لائوس و مکزیک و ئوستралیاش دەڵێن یابانی. بەڕاستی هەڵەیە." بۆ وەڵامی ئەو خاڵە بە پێویستی دەزانین ئەوە روون بکەینەوە کە ئەم خوێنەرە لە وشەی (بیانی) و (یابانی) نەگەیشتووە و لای وایە یەک مانایان هەیە. وشەی (بیانی) لە کوردستانی باشوور بۆ شتێک یان کەسێکی بێگانە بەکاردەهێنرێت. هەژار لە "هەنبانە بۆرینە"دا هەمان مانای نووسیوە. وشەی (یابانیی) پێناسەی شتێک یان کەسێک دەکات کە لە وڵاتی (یابان/ژاپۆن)ەوە هاتبێت و هیچ پەیوەندییەکی بە وشەی (بیانی)یەوە نییە. مرۆڤێک کە لە مەکسیکەوە هاتبێت پێی دەووترێت (مەکسیکی) و ئەوەی لە تایلەندەوە هاتبێت پێی دەووترێت (تایلەندی) نەک (یابانی). خاڵێکی دیکەش ئەوەیە کە کوردی کوردستانی باشوور ناوی

وڵاتەکانیان لە عەرەبییەوە وەرگرتووە و کوردی ڕۆژهەڵاتیش لە فارسییەوە. بۆیە کوردی باشوور دەڵێن (یابان) و کوردی ڕۆژهەڵاتیش دەڵێن (ژاپۆن). لە کتێبی قوتابخانەکانی کوردستانی باشوور (ژاپۆن)یش بەکاردەهێنرا. ناوی وڵاتەکەش (ژاپۆن) نییە وەک کاکی خوێنەر پێیی وایە، بەڵکو بە یابانیی/ژاپۆنیی پێی دەووترێت (نیپۆن).

## خوێنەران ئەرازوویەکن لەوانەی کە "کۆنتراکت"ی پێ هەڵ دەسەنگێنن

لەبەرئەوەی کە زمانی کوردی لە بەشە جیاوازەکانی کوردستاندا گەلێک وشەیان لە زمانی تورکی و عەرەبی و فارسییەوە وەرگرتووە، زۆرجار بۆ هەمان شت سێ وشەی جیاواز لە بەشەکانی کوردستان بەکاردەهێنرێن. ئێمە هەوڵ دەدەین کە بۆ ئەو وشانەی کە لە کوردستانی باشوور بەکاردەهێنرێن، لە کەواندا ئەو وشانە بنووسین کە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا، کە بیتی عەرەبی دەخوێننەوە، بەکاردەهێنرێن. ئەو کاتە، لەکاتی یەکەم بەکارهێنانی وشەیەکدا، بەرامبەرەکەی دەنووسین. بۆ نموونە: لوغم (مین)، پاسکیل (دوچەرخە)، تەئمین (بیمە)، یابان (ژاپۆن).
چەند خوێنەرێک دەربارەی ئەو پرسیارنامەیەی کە ناردبوومان، هێندێک سەرنجیان بۆ ناردووین. ئەو ئامارەی کە لەو پرسیارنامەیەوە دەست کەوتووە لە لاپەرەکانی پێشوودا بڵاوکراوەتەوە. لێرەدا تەنیا وەڵامی ئەو خوێنەرانە دەدەینەوە کە لە وەڵامی پرسیاری "کۆنتراکت بڵاوکراوەیەکی نوێیە. ئەم گۆڤارەت پێ چۆنە؟"دا نووسیویانە کە جارێ زووە بۆ ئەم پرسیارە و دەبوایە ئەم پرسیارە لە دوای ژمارەکانی دە و دوانزەی گۆڤارەکە بکرایە. بۆ وەڵامی ئەم خوێنەرانەش دەڵێین: لە پرسیارنامەکەدا داوامان لە خوێنەران نەکردبوو کە رای خۆیانمان دەربارەی ژمارەی دەی "کۆنتراکت" پێ بڵێن، بەڵکو داوامان لێ کردبوون کە رای خۆیان دەربارەی گۆڤارەکە بڵێن لە روانگەی ئەو چەند ژمارەیەی کە بەرچاویان کەوتووە. مەبەستمان لەو پرسیارە ئەوەبوو کە بزانین شێوە و چۆنێتیی بەرهەمەکانی گۆڤارەکە تا ئێستا لەلایەن خوێنەرانەوە چۆن دەبینرێت و ئەگەر هەڵەی زەقمان هەبێت لەئێستاوە هەوڵی چاککردنیان بدەین و چاوەڕێ نەکەین تا ژمارەکانی دە و دوانزە. ئێمە پێمان وا نییە خوێنەری کورد دەبێت هەموو شتێکی نووسراوی کوردی بخوێنێتەوە و قبووڵی بکات، بەڵکو دەبێت داواکاریی هەبێت لەسەر ئەو بەرهەمانەی کە بڵاودەکرێنەوە. ئەوە چاوەڕوان دەکەین کە خوێنەری کورد ئەو گۆڤارانە بخاتە تەنەکەی خۆڵەوە کە لە ناسکترین بارودۆخی نەتەوەی کوردیدا هیچ هەڵوێستێک نانوێنن. هەر لەبەر ئەو هۆیەش پرسیارنامەیەکی وا دەنێرین بۆ خوێنەران. ئێمە دەمانەوێت بزانین ئایا "کۆنتراکت" کەلێنێکی بچکۆلە لەو بۆشاییە گەورەیە پڕدەکاتەوە کە لە هەڵوێستدەربڕین بەرامبەر مەسەلەی کورددا هەیە. ئایا چی بکەین بۆ ئەوەی "کۆنتراکت" ببێتە دەنگی هەموو ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت هەڵوێست بەرامبەر بەو بارودۆخە ناسکەی کورد وەربگرن. "کۆنتراکت" دەیەوێت پەیوەندییەکی دینامیکی، لەگەڵ خوێنەرەکانیدا درووست بکات. ئێمە ئێوەی خوێنەر بەو تەرازووە دادەنێین کە "کۆنتراکت"ی پێ هەڵدەسەنگێنین. بۆیە داواتان لێ دەکەین کە بەردەوام بن لە ناردنی سەرنج و پێشنیار و رەخنەکانتان. لەهەمان کاتدا، داواتان لێدەکەین کە ئەو هەقەش بدەن بە کۆنتراکت بۆ ئەوەی داکۆکی لە خۆی بکات و وەڵامی رەخنەکانتان بداتەوە و بەچاوی رەخنەوە سەرنج و پێشنیارەکانتان هەڵبسەنگێنێت.

## گوڵبژێرێک لە نامەی خوێنەران

لێرەدا گوڵبژێرێک لەرای هێندێک خوێنەران دەقاو دەق، بێ گۆڕینی رێنووس و شێوەی دارشتنی نامەکان، بڵاودەکەینەوە:
# خوێنەرێک دەنووسێت:"بڵاوکراوە کوردییەکان ئاوێنەی میللەتە سەرلێشێواوەکەمانن. ئەوانەی لەدەرەوەی وڵات دەردەچن باس لەناو کوردستان دەکەن باس لەم سەردەمەی کورد دەکەن لە کوردستان. کە هەر هەموان دەیزانین. ئەوانەی لەناویشەوە دەردەچن باس لەم دەرەوەی وڵات و پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیای تازە دەکەن. کە هیچی لێ نازانن. بەشێوەیەکی گشتی بڵاوکراوەی کوردی هیچ زانیارییەکی گشتی و هەمەلایەن نادەن بەمرۆڤ."
# خوێنەرێکی دیکە نووسیویەتی:"کۆنتراکت خاوەنی دەنگی خۆیەتی. هەندێ بابەت دێنێتە پێشەوە کە پێشتر گۆڤار و بڵاوکراوە کوردییەکانی دەرەوەی وڵات خۆیان لێ نزیک نەکردۆتەوە، وەیان نەیانویستووە خۆیان لێ نزیک بکەنەوە."
# خوێنەرێکی دیکە نووسیویەتی:"گۆڤاری کۆنتراکت دەستپێکێکی بەجێ یە لە جیهانی بڵاوکردنەوەی کوردیدا. باسەکانی، بەدەگمەن نەبێت، لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردیی یەکانی دیدا بڵاوناکرێنەوە. ..... ئێوە نابێت لە گۆڤارەکە رازی بن و ئێمەش ئومێدی سەرکەوتنی بۆ دەخوازین و پاڵپشتانین."
# "بەهۆی پارتە خائینەکانی باشور و سەرکردە خوێڕیەکانی وە، کاریگەری و لەهەلادانی داگیرکەران لە بیر نەکرێت، چونکە خۆتان ووتەنی ئەوان لەوەیان تێپەڕاندووە کە رەخنەیان لێبگیرێت." ئەم خوێنەرە ئەم پێشنیارەشی کردووە: "بڵاوکردنەوەی ووتاری ناسیۆنالیستی و نەتەوەیی وەکو بیرێک و ریسواکردنی حیزبە عێراقچی و ئێران چیەکان."
# "زۆر لە رۆشنبیر و نوسینەکان، بە پارە و ماستاو و مامەحەمەیی لاواز دەبن، تکایە با کۆنتراکت، هەر بوێر و راست بێ ! ....... بەردەوامیتان قوربانی و پارە و ماندووبون و رەخنەی دەوێ، بۆیە گرنگە."
# "گۆڤارێکە بێ جیاوازی پەردە لەسەر زۆربەی زۆری رێکەوتن و، ووتارو، خۆفرۆشی و هەڵوێست و ئایدۆلۆژی زۆربەی سەرکردە کوردەکان لائەبات و روونی ئەکاتەوە ئەمە چۆن هەڵە و تاوان و خیانەتە و ئەڵتەرناتیفەکەشی بۆ ئەنوسێت بەشێوەیەکی زانستی و کوردستانیانە."
# "کۆنتراکت بە گشتی و لە سەرجەم دا، گۆڤارێکی رەخنەگرەو ئەمە باش نی یە. دەبێت ئەم گۆڤارە راستی یەکان بڵێت. هەندی لە رێکخراوە و پارتی یەکانی کوردستان لە چەند بواری مێژوویی دا خزمەتیان کردوە و دەبی ئیشارەی پی بکریت. ........ شێوەی نوسینی گۆڤارەکە لەباری ئەدەبی کوردی یەوە رەوان پوخت نی یە. بەخشانەکان هێشتا رەنگ بوی تەرجومەی فارسی و عەرەبی و تورکیان تیدایە."
# "زمانی نووسین و شێوازی دارشتنی وتارەکانی سەرنج راکێشن، گۆڤارێکە دەکرێت بەشداری لە گۆرانکاری سیاسی لە هەناوی کۆمەڵگەی کوردەواری و بزاڤی رزگاریخوازی کوردستاندا بکات. بەلام بەداخەوە چەندە پێخۆشحاڵ دەبوم بەو ئەندازەیەی کە داکۆکی لە داخوازە نیشتمانی یەکان و ئازادی سیاسی دەکات، بەهەمان ئەندازەش داکۆکی لە مافی کرێکاران و زەحمەتکێشانی کوردستان بکردبایاو ببوایە بە رێگایەک بۆ یەک خستنی هەموو تولە رێگاکانی خەباتی رەنجدەرانی کوردستان."
بۆ هەموو ئەم خوێنەرانە و ئەوانەی دیکەش کە نامەیان بۆ ناردووین دەڵێین: زۆر سوپاس بۆ ئەوەی کە سەرنج و پێشنیار و رەخنەمان بۆ دەنێرن. بەردەوام بن لە ناردنی نامەکانتان چونکە ئێمە دڵنیاین کە ئەو پرۆسەیە نەک هەر بۆ ئێمە و "کۆنتراکت" سوودی هەیە، بەڵکو ئێوەش سوودی لێ دەبینن.

# ئاشتی و تەبایی



سەرچاوەی وێنە: DN.   **پێکەنینی ئەسپێک**

زۆربەی ئەوانەی لە کوردستانیشن، بە ڕەسم بێت یان بە تەلەفیزیۆن، کۆترەکانی سەنتەری پایتەختەکانی ئەوروپایان بینیوە کە لەسەر دەست و شانی خەڵکی دەنیشنەوە.
لە سوید مراوی لەناو ئاوەکانی ناوشاردا دێن و دەچن و نان لەسەر دەستی مرۆڤ دەخۆن. کەروێشک، پۆر لەناو گەڕەکەکاندا دەسوڕێنەوە. بێگانەیەکی خۆمان ئاسایی، یەکەم جار بە ئەقڵییدا ناچێت کە ئەم باڵدارانە کێوین.
ئەوەی لە کوردستانیشەوە هاتبێت دەزانێت کە لە وڵات ئەگەر لە خوارەوە یەکێک دەست بەریت بۆ سەری، لەسەرەوە کۆترەکان بە گومەزەکانەوە دەدەن لە شەقەی باڵ. ئەو باڵدارو ئاژەڵە کێویانەی تریش، لە زۆربەی ناوچەکاندا خۆیان لە قەمچی تفەنگدا ناگرن. ڕەنگە لای زۆربەمان ئەو ڕایە هەبووبێت کە ترس و هەڵهاتنی گیانلەبەرە کێوییەکان پەیوەندی بە کارەکتەری زگماکیی ئەو گیانلەبەرانە خۆیانەوە هەبووبێت نەک بە دڕندەیی ئێمەوە. بەڵام هەڵسوکەوتی جیاوازی هەمان سنفی ئەو گیانلەبەرانە لە وڵاتێکی تر، ئەوە پیشان دەدات کە گیانلەبەرە کێوییەکان لە خۆیانەوە ڕاناکەن. سرکییان لە کوردستان خراپیی ئێمەو، ڕامبوونیان لە وڵاتانی تر باشیی خەڵکی ئەو وڵاتانە دەرهەقی ئەو گیانلەبەرانە پیشان دەدەن. ئەوەی پەیوەندی بە بواری سیاسی ئەمڕۆی کوردەوە هەیە لە ڕێگای ئەم پرسیارەوە دێتە مەیدانەوە:
چۆن ئەم گیانلەبەرانەی ئێمە بە بێ ئەقڵییان لە قەڵەم دەدەین، لەم ڕاستییانە تێ دەگەن؟
گیانلەبەرەکان لە پراکتیکدا و لە ئەنجامی "تاقیکردنەوە"وە دەوروبەرەکەیان دەناسن.

## پەیڕەوی کۆنتراکت

هێندێک خوێنەر بە نامە پێیان ڕاگەیاندووین کە دەیانەوێت بەرهەممان بۆ بنێرن. ئێمە بەو خوێنەرانە دەڵێین: پێمان خۆشە بەرهەممان بۆ بنێرن و ناوەڕۆکی "کۆنتراکت" دەوڵەمەندتر بکەن. بەڵێنی ئەوە دەدەین کە هەموو بەرهەمێک بە یەک چاو هەڵبسەنگێنین. هەر بەرهەمێک بەشێوەیەکی زانستییانەو بابەتییانە نووسرابێت و دیاردەیەکی سیاسیی سەردەم ڕوون بکاتەوە ئەوا جێگای خۆی لەسەر لاپەڕەکانی "کۆنتراکت" دەکاتەوە. بەواتایەکی دی، چۆنێتی نووسینێک بسوولەی بڵاوکردنەوەی دەدات نەک ناوی نووسەرەکەی. تکایە بەرهەممان بۆ بنێرن، بەڵام ئەم خاڵانەی خوارەوەش بەوردی ڕەچاو بکەن:

١. لەبەر کەمیی جێگا "کۆنتراکت" نووسینی دوورودرێژ بڵاوناکاتەوە. تکایە هەوڵ بدەن ئەو وتارانەی کە بۆ "کۆنتراکت"ی دەنێرن (بە وێنە و خشتە و پەراوێزەوە) لە چوار لاپەڕەی چاپ زیاتر نەبێت. ئەوەشتان بیر نەچێت کە "کۆنتراکت" بڵاوکراوەیەکی سیاسییە.

٢. هیچ بەرهەمێک ناگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەنەکەی. بۆیە، پێویستە کۆپییەکی ئەو بەرهەمەی کە بۆ "کۆنتراکت"ی دەنێرن لای خۆتان هەبێت.

٣. "کۆنتراکت" مافی ئەوە بەخۆی نادات دەستکاریی ناوەڕۆکی هیچ وتارێک بکات. بەڵام ئەگەر وتارێک پێویستی بە دەستکاریکردن بێت بۆ چاککردنی لایەنی زمانەوانییەکەی، ئەوا "کۆنتراکت" مافی ئەوە بەخۆی دەدات دەستکاریی وتارەکە بکات. لەبەرئەوە، هەر بەرهەمێک دەستکاریی بکرێت، پێش بڵاوکردنەوەی، دەنێردرێتەوە بۆ خاوەنەکەی بۆ ئەوەی ئاگاداری ئەو دەستکاریکردنانە بێت. ئەگەر خاوەنەکەی ئەو دەستکاریکردنانەی قبوول کرد، ئەوکاتە "کۆنتراکت" وتارەکە بڵاودەکاتەوە.

٤. لەکاتی بڵاوکردنەوەی نامەی خوێنەرێکدا، دوو پرنسیپ پەیڕەوی دەکەین: یەکەم، لە حاڵەتی زۆر تایبەتی و پێویستدا نەبێت ناوی خوێنەر بڵاوناکەینەوە مەگەر خوێنەرەکە خۆی لەنامەکەیدا مافی ئەوەی دابینی کە ناوی بڵاوبکەینەوە. دووەمیش، هەر نامەیەک شیاوی بڵاوکردنەوە بێت، بێ دەستکاریی ڕێنووسەکەی، تەنانەت ئەگەر هەڵەشی تێدا بێت، بڵاودەکرێتەوە.

کەچی ئێمەی ئاقڵ، ئێمەی گەلێک لەوان، لە ڕووی بایۆلۆجییەوە، پێشکەوتوتر، تا ئێستاش چاوەڕوانیی ئاشتی لەو دوو هێزە شەڕکەرە دەکەین.

لەو بڕوایەدا نیم کە ئەو زنجیرە شەڕەی نێوانیان کە مێژوویەکی درێژی گرتووە کەم بێت بۆ ئەوەی ئێمەش وەکو گیانلەبەرەکانی تر، بە **"تاقیکردنەوە"** بۆمان دەربکەوێت کە ئەم دوو هێزە جێگای هیوا نین؟

بەڵام ئایا بۆ چاوەڕێی ئەوەین ئەوانە کوردستان ڕزگار بکەن کە سوپای داگیرکەرەکە دەهێننە سەر کوردستان؟ ئەوانەی وڵاتەکە تاڵان دەکەن، وڵاتەکە بەرن بەڕێوە؟ ئەو بەردەی نوقم دەبێت بکەوێتە سەر ئاو؟

بێمافیی کارەکتەرە سروشتییەکانیشی لێ سەندووینەتەوە. ئەوەی ئێمە هیوامان پێیەتی، لۆژیکی گیانلەبەرەکان پێکەنینی پێی دێت. ئیتر دەسەڵاتی دژکار، بە خۆی و دامودەزگا و نووسەرو هونەرانییەوە، لەوە زیاتر مرۆڤ بۆ کوێ دوا بخات!

## سەرکردەی حیزبەکان لە ئەستێرەیەکی ترەوە دانەبەزیوون

سەرکۆماری وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بیل کلینتۆن، لەسەر درۆکردن و فشارخستنە سەر ئافرەتێک ( کە پەیوەندی سێکسی لە گەڵدا هەبووە) بۆ درۆ پێکردن، دەدرێت بە لێپرسینەوەی دادگایی. کەچی وەزیری دەرەوەی هەمان وڵات، **مادەلین ئۆلبرایت**، لە کاتی چوونی سەرۆکی (پارتی) و سکرتێری (یەکێتی)دا بۆ ئەوێ، دەڵێت کە ئەم دووانە نوێنەری ڕاستەقینەی موعارەزەن. ئەمە بۆ یەکێک ئەگەر مافی ئەوە بدات بەخۆی تێ بگات، جنێوێکی گەورەیە. بەڵام زەحمەتە بتوانێت بیسەلمێنێت کە "مادەلین" ڕاست ناکات. چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو سەرکردانە هیچ نەماوە بەسەر کوردیا نەهێنن، بەڵام ئەو خەڵکە لە بواری سیاسیدا تا ئێستا نەیتوانیووە بیسەلمێنێت کە ئەو سەرهێزانە نوێنەری ئەو نین.

## مرۆڤی کورد بەندە بەو بڕیارانەوە سەرکردەکانی دەیان دەن

دوای هەڵبژاردنی (١٩٩٨/٩/١٩)ی سوید، دەنگی ڕەخنە لەناو سۆسیال دیموکراتەکاندا بەرز بووە. **یۆران پارشۆن** کە سەرۆکی سۆسیال دیموکراتەکانەو سەرۆوەزیرانی حکومەتە، کەوتە بەر ڕەخنەی ئەوەی کە بڕیاری سەربەخۆی داوەو پشتی بە گفتوگۆ نەبەستووە. ڕۆژنامەی "داگنس نیهێتەری" ڕۆژی ١٩٩٨/١٠/١ نووسیبووی کە یۆران باشتر وایە وەکو سەرۆوەزیران بمێنێتەوە، بەڵام لە پایەی ئێستای ناو حیزبی واز بهێنێت. ئەمە لەسەر ئەوەی کە سۆسیال دیموکراتەکان وەکو پێویست لە هەڵبژاردندا نە چوونە پێشەوە.

هەر کاتێکیش شەڕ لە نێوانی یەکێتی و پارتیدا دەوەستێت، ملکەچییان بۆ تازە دەکرێتەوە. تا ئێستاش ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران و دوکتۆران کە بە خۆیان دەڵێن ڕۆشنبیر، نەسیحەت و بەرنامە دەنێرن بۆ سەرکردەی هێزەکان. ئیتر ئەو هەموو کوشتارو ماڵوێرانیی و بێ هیواییەی هەیە، تا ئێستا نەیتوانیووە لێپرسینەوەیەک لای خەڵکەکە دروست بکات. بۆیە هەم شەڕ ئاساییە بەردەوام بێت، هەم کۆبونەوەکان، بەرژەوەندی وڵاتانی لێ دەرچێت، ئاساییە حسابی کوردی تێدا نەبێت.

**ناسر حەفید**
١٩٩٨/١٠/٣

---


**نامەو ئەو دیسکێتانەی بە Macintoch دەنووسرێت، بۆ ئەم ناونیشانە دەنێردرێت:**

**Kontrakt**
**F.stålsgatan 96**
**754 39 Uppsala**
**Sweden**

**نرخی ژمارەیەک لە سویددا بە پارەی پۆستەوە، ٤٠کرۆنە. بۆ دەرەوەی سوید ٤ دۆلار، جگە لە پارەی پۆست.**

**ژمارەی پۆست جیرۆ:**
**Post giro:**
**6196267-6**

**ئەوانەی دەرەوەی سوید دەتوانن ئابوونەکەیان بە نامە بنێرن.**

**ئەو وتارانەی بە PC دەنووسرێن، دەنێردرێن بۆ ئەم ناونیشانەی خوارەوە:**

**Kontrakt**
**Gladiolusgatan 4A NB**
**431 61 Mölndal**
**Sweden**

**Fax: 031- 7769433**

CONTRACT

Political Journal

Number 3

October 98

# To oppress is easy, but to govern is a real challenge

*In this issue:*





Kurdistan is a place of one of the oldest civilizations. The Irbil castle is >5000 years old



Can they ever forget their beloved ones?

*Some quotes:*

"We either cross the sea and eat fish or drown and be eaten by fish" A Kurdish refugee before crossing the Aegean Sea.

"Half of what is done is decided by the other side. The issue is not only that an oppressive authority puts itself above the law, but it is also that there are people who abandon their rights and declare their unconditional obedience" Nasir Hafid (see the article in this issue)

"Italy made a mistake. How can a NATO member host a terrorist organisation that threatens the unity of another NATO member state?" Kokmaz Haktaniz (Turkish Senior Foreign Ministry official)'s comment on a meeting held by the "Kurdish Parliament in-Exile" in Rome.